دەترسم، بۆ ئەوەی مرۆڤ بتوانێ لەم جۆرە تاقی کردنەوانە رزگاری ببێ دەبێ ئیمانی خۆی زۆر بەهێز بکات، ترسی خوای گەورەی بچێتە دڵ، بیر لە ئاکامی گوناهەکە بکاتەوە، سزای خوای بێتە بەرچاو، هەروەها خۆیشی لە نەزەر و گوناهی نزیك خەرەوە پاراستبێ، ئەگەر موسڵمانێك بەم جۆرە بێ خۆپاراستن لە ئافرەتی داوێن پیس گەلێك ئاسانە، بەڵام یەکێك هەردەم بیر لەو جۆرە کارە حەرام و گوناهانە بکاتەوە و خۆی لە نەزەر نەپاراستبێ ئەوا دەبێ لە ئیمانی خۆی بترسێ، کە زەحمەتە لەم تاقی کردنەوەیە رزگاری بکات.

ـ ورجل تصدق أخفى حتى لا تعلم شماله ما تنفق يمينه: پیاوێك سەدەقەیەك ببەخشی و بیشارێتەوە کە بە دەستی راستە دەیبەخشێ دەستی چەپەی پێی نەزانێ: لێرەدا سەدەقە هەمو بەخششێك دەگرێتەوە زەکاتیش، هەروەها شاردنەوە و دەرنەخستنی سەدەقە باشتر و خێرترە، وەك ئاشکرا کردنی، چونکە ئیخلاس و دووره ریایی لێ دێتە جێ.

ـ ورجل ذكر الله كثيراً ففاضت عيناه: پیاوێك، کە بە تەنیا دوور لە خەڵکی یادی خوا دەکاتەوە جا لەبەر خۆشەویستی خوای یان لە ترسی عەزابەکانی فرمێسکان هەڵبرێژێ و بگریێت.

★. سەرنج: کە لەم فەرمودەیەدا تەنها ناوی (پیاو) هاتوە مانای وا نییە، کە ئافرەتانیش بەشدار نین نەخێر، بەڵکو تەنها لە کۆمەڵی یەکەم (الامام العادل) و (ورجل قلبه معلق في المساجد)دا نەبێ ئەوا لەوانی دیکە ئافرەتانیش دەگرێتەوە، چونکە بۆ ئافرەتان وا خێرترە لە ماڵەوە نوێژەکانیان بکەن، نەك لە مزگەوت.

### وانەی هەشتەم:

عن سهل رضي الله عنه قال: قال رسول الله ﷺ:

لا يؤمن احدكم حتى يحب لأخيه ما يحب لنفسه[1].

واتە: (کەستان ئیمانتان تەواو نابێ تا ئەوەی بۆ خۆتان پێتان خۆشە بۆ برا ئیماندارەکانیشتان پێتان خۆش دەبێ).

- لە زۆر فەرمودەی صحیح دا ئەم عیبارەتە بەرێزەی پێغەمبەرﷺ دووبارە بۆتەوە، کە فەرمویەتی (لا یؤمن احدکم) مەبەست لەم وتەیە، کە ئەگەر هەریەکێك فەرمانەکەی کراوە جێبەجێ نەکات ئەوا ئیمانەکەی تەواو نابی و بە ناتەواوی دەمێنێتەوە، مەبەستی ئەوە نییە بە یەکجاری لە ئیمان دابڕی و ببێتە کافر.

یەکێك لە بەشەکانی ئیمان بریتییە لە خۆشەویستی برایەتی ئیمانی هەریەکێ ئیمانی هێنا پێویستە لەگەڵ براکانیدا هاودەم و هاوشاد بێت، کە ئەمەش دەبێتە مایەی بەرزبونەوەی ئیمانەکەی..

ئەم فەرمودەیە فەرمانە بۆ موسڵمان، کە هەرگیز ڕقیان لە براکانیان نەبێتەوە و ئێرەییان پێ نەبەن، زیانیان پێ نەگەیەنن وپشتیان تێ نەکەن، بەڵکو بە پێچەوانەوە خۆشیان بوێن، خۆزگەیان بۆ بخوازن، قازانجیان بۆ فەراهەم بێنن، هانیان بدەن، پشتیان بگرن.

چۆن حەز دەکات خۆی سەرکەوێت و لە ژینێکی بەختیارانە بێ، واش حەز بکات بۆ براکانی، هێندە ڕشت بێت لەسەر برایەتی و پاراستنی بەرژەوەندی برایەکانی، کە بە هیچ شێوەیەك وای لێ نەیەت حسابی موسڵمانان بفەوتێنێت، نەخوازەڵڵا بۆ حیسابی جاهیلانیش بێت.

ئیماندار لای خوا نرخی لە ئاسمان و زەوی گەورەترە، کافریش بەقەد سەنگی پێشکە (مێشوولە)یەك بەهای نییە، ئاخر چۆن دەبێ ئیماندار ببوغزێنرێت و کافرانیش خۆش بویسترێن؟! دژایەتی ئیمانداران بکرێ و، دۆستایەتی کافرانیش بکرێ؟! یان ئیمانداران وەکو کافران ڕەفتاریان لەگەڵ

---

١- البخاري/رقم/١٣ الايمان ومسلم /رقم/٤٥/ الايمان. متفق عليه.

بکرێت، کە خواش دەفەرموێت: ﴿أَفَنَجْعَلُ الْمُسْلِمِينَ كَالْمُجْرِمِينَ (٣٥) مَا لَكُمْ كَيْفَ تَحْكُمُونَ﴾[١].
﴿أَفَمَن كَانَ مُؤْمِنًا كَمَن كَانَ فَاسِقًا لَّا يَسْتَوُونَ﴾[٢].

١ـ واتە: ئایا چۆن دەبێ موسڵمانان و تاوانباران وەك یەك تەماشا بکەین، چیتانە چۆن حوکم دەردەکەن؟!

٢ـ واتە: ئایا ئەو کەسی ئیمانداره وەك کەسێکی فاسق وایە؟ نەخێر یەکسان نین.

ئەم فەرمودەیە یەکێکە لە بنەڕەت و بناغە هەرە گرنگەکانی دینی ئیسلام، لێرەدا پێغەمبەرﷺ یاوەران و گشت بڕواداران فێردەکات خۆپەرست نەبن، چونکە ئەوە لەگەڵ ئیمان ناگونجێ، ئەوانەی ئیماندارن چاك هەست بەوە دەکەن، کە هەرکاتێ ئیمان دڵان داگرێ، هەر دەستبەجێ ڕۆحی خۆپەرستی دەمرێ و لەجێیدا ڕۆحی بەخشین و فیداکاری و خۆنەویستی و یەکترگری دەڕوێت.

ئیماندار دەبێ وا هەست بکات لەگەڵ براکانی یەك جەستەیە ئازاری وان ئازاریەتی، شادمانیان شادیەتی، قازانجی ئەوان قازانجیەتی بگاتە ئەم ڕادەیەی چۆن بەرگری لە خۆی دەکات، ئاواش بەرگری لە برا ئیماندارەکانی بکات، بە تایبەتی لەم ڕۆژگارەدا، کە خەڵکی نەفام تێکڕا چاویان بڕیوەتە ئیمانداران و بیانبینن بیدۆڕێنن، زەمیان دەکەن دژایەتی و پڕوپاگەندەیان بۆ هەڵدەبەستن، گەر وا نەبێ ئەوا ئیمانەکەی زۆر بێ هێز و نرم و ناتەواوە.

کۆمەڵگەی ئیسلامی تاکە کۆمەڵگەیەکی بێ وێنەیە، کە ئەو جۆرە خۆشەویستنە و برایەتییەی تێدا بێت، ئەم کۆمەڵگەیە کەسانێکی تێدا پەروەردە دەبێ، کە لە سەرەمەرگدا بێت خەریکی مردن بێت لە تینوان، ئینجا

---

١ـ القلم/٣٥_٣٦.
٢ـ السجدة/١٨.

ئـاوی بـۆ بێـنن و بیخەنـە سـەردەمی، نەیخواتـەوە و بڵـێ: بیبـەن بـۆ بـرا برینداره‌کـەی تەنیشـتم، وا دیـاره ئـەو لـە مـن تینـوتره؟! ئـادەی کـوا ئـەم فیداکارییـە لـە کـام کۆمـەڵ خـۆی دەنوێنـێ، بێجگە لـە کۆمەڵگەی ئیسلامی؟! کۆمەڵگەی ئیسلامی کەسانی وای تێدا گۆش دەبێ، کە لـە زینـدانی تاغوتـان بـە پیسترین شێواز تەعزیب بدرێن، تەنها داوای ئیعتیرافی لێ بکەن، لەسەر براکانی!

ئـەویش بڵـێ: بـە خـوا گەمـژەن! مـن چـۆن براکـانی خـۆم توشـی ئـەم ئەشکەنجەیە دەکەم، کە خۆم تێیدام؟! لە ئەنجامدا شـەهید بکـرێ، بـەڵام تـەنها تاکە پیتێکی لە دەم نایەتە دەرەوە.

کۆمەڵگەی ئیسلامی پیاوی وا دێنێتە ئارا کە هـەردەم خـەمی براکـانی بـێ، ئەگەر چی بۆ سێ رۆژیش بێ پارویـەك نـانی نەچوبێ بـە گەرویـدا، بـەڵام کـە دەنکێـك خورمـا بدۆزێتـەوە بیکـات بـە دوو لـەت و بـۆ خـۆی و براکەی بەشی بکات!!

تەنها لە کۆمەڵگـەی ئیسلامی دەوەشـێتەوە، کـە نـان دەبەخشی و پێویستی خەڵك دابین دەکات، لە ناخی دڵیەوە پڕ بە دڵ بیبەخشی و پێی خۆش بـێ بـێ ئەوەی هیچ فشار و یاساشی لەسەر بێ!

﴿وَيُطْعِمُونَ ٱلطَّعَامَ عَلَىٰ حُبِّهِۦ مِسْكِينًا وَيَتِيمًا وَأَسِيرًا﴾[1]. واتـە: بـە خۆشـی و ئـارەزووی دڵی خۆیان خواردن دەبەخشن بە فەقیر و هەتیوو ئەسیرەکان.

ئەمـەش لەبەرئـەوەی بـە قورئـان و فـەرمودە پـەروەردە بـون لـە کانیـاوی فەرمودەکانی پێغەمبەرﷺ هەناویان فێنك کردۆتەوە و تینویەتییان شکاندوە.

یـاوەرانی یاریـدەدەرانیان لـە دەمـی خۆیـان گرتومتـەوە و بـە یـاوەرانی کۆچکەریان داوە،﴿وَيُؤْثِرُونَ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمْ وَلَوْ كَانَ بِهِمْ خَصَاصَةٌ﴾الحشر:٩.

واتـە: (براکانیـان) بەسـەر خۆیانـدا هەڵدەبـژێرن هەرچـەندە بـۆ خۆشـیان پێویست و موحتاج بن، کاتێك کۆچکەرەکان نزیکەی دووسەد کەسیان لێ بـێ

---

١ـ الانسان/٨.

جێ و ڕێ مانەوە هەمویان لە ژێر کەپرێکی ژێر مزگەوتەکەی مەدینەوە حەوانەوە، یاریدەدەران بە تاریکی شەوێ خواردنیان بۆ دەهێنان، نەوەکو خەڵك بزانی و ببێتە ڕیاکەری، پاشان نەوەکو ببێتە منەتێك بەسەر کۆچکەرەکانەوە.

(سبحان الله) کوا ئەمڕۆ؟! بەڵکو لە کام سەردەم شتی وا ڕویداوە، لە ئەمڕۆی ڕۆژئاوا کە لاف ماف مرۆڤ لێ دەدات، بە هەزاران کەس بێ سەر و شوێن دەچنە ژێر خاکی مردن، لە تاوی برسیەتی و نەبونی! کەچی بەسەدان دەوڵەمەندی زگ تێریش لە قاقای پێکەنینە و هەر ئاگای نییە لە فرمێسکی دایك و خوێنی چاوی منداڵانی زگ بەتاڵ !

خوایە ئەم جارەش ئەم کۆمەڵگەیەمان بۆ بگێڕیەوە، کە خۆت لە وەسفتدا فەرموتە:

﴿كُنتُمْ خَيْرَ أُمَّةٍ أُخْرِجَتْ لِلنَّاسِ تَأْمُرُونَ بِالْمَعْرُوفِ وَتَنْهَوْنَ عَنِ الْمُنكَرِ وَتُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ﴾[١]. واتە: ئێوە باشترین کۆمەڵ و نەتەوەن بۆ ئادەمیزاد ڕەوانەکراون: فەرمان بە چاکە دەکەن و ڕێ لە خراپە دەگرن و باوەڕتان بە خوا هەیە.

## وانەی نۆیەم:

عن أبي رقية بن أوس الدادريﷺ أن النبيﷺ قال:

(الدين النصيحة قلنا لمن؟ قال: لله، ولكتابه، ولرسوله، ولأئمة المسلمين وعامتهم)[٢].

١ـ آل عمران/ ١١٠.

٢ـ رواه مسلم.

واتە: ئایین دڵسۆزی و ئامۆژگارییە، گوتمان بۆ کێ ئەی پێغەمبەری خوا؟ فەرموی: (بۆ خوا و قورئان و پێغەمبەر و موسڵمانان و هەمو خەڵکی بە گشتی).

ـ تیشکی یەکەم: کە پێغەمبەرﷺ دەفەرموێت: (الدین النصیحة) مانای ئەوە نادات، کە دین بریتی نییە لە شتی دیکەی غەیری ئەوانەی باسکراون، بەڵکو مەبەستی ئەوەیە، کە یەکێك لە بەشە هەرە دیار و گرنگەکانی ئیسلام دڵسۆزی و ئامۆژگارییە، ئەوە وەکو ئەو فەرمودەیەوایە، کە دەفەرموێت: (الحج عرفة): حەج عەرەفەیە، خۆ ئاشکرایە حەج کردن تەنها بریتی نییە لە عەرەفە، بەڵکو زۆربەش و ڕوکنی دیکەشی هەیە، بەڵام لێرەدا مەبەستی دەرخستنی گرنگی عەرەفەیە لە حەجدا.

ـ **تیشکی دووەم:**

١ـ دڵسۆزی بۆ خوا: بریتییە لە بڕواهێنان بە خوا و شرك پەیدا نەکردن و نەترازان لە ناوو سیفەتەکانی خوا و پاککردنی خوا لە هەمو کەم و ناتەواوییەك و جێبەجێکردنی فەرمانەکانی و خۆشویستن و ڕق لێ بونەوە لە پێناو خوا و جیهاد کردن و ئیخلاس و دوعا کردن و هەمو ئەمر و نەهییەك کە خوا بە ئێمەی فەرمووە.

٢ـ دڵسۆزی بۆ قورئان: مانای ئەوەیە بڕوا بێنێ کە قورئان لە لایەن خواوە هاتووە و بریتییە لە قسەی خوا و، لە قسەی بەندە ناچێت، بیخوێنێتەوە و لەبەری بکات و فەرمانەکانی ڕاپەڕێنێ.

٣ـ دڵسۆزی بۆ پێغەمبەرﷺ : مانای وایە بڕواهێنان بە پێغەمبەرایەتی و بەرگری کردن و دژایەتی کردنی هەمو دژانی پێغەمبەرﷺ بڵاو کردنەوەی سوننەت و زیندوو کردنەوەی ڕێ و شوێنی پێغەمبەرﷺ دەگرێتەوە.

٥ ـ دڵسۆزی بۆ خەڵکی موسڵمانان: مانای ڕێ نیشاندانی خەڵك دەگرێتەوە بۆ هەر کاروبارێك، کە سوود و قازانجی ئاخیرەتیانی تێدا بێ.

ـ تیشکی سێیەم: برای موسڵمان، وەکو لەم فەرمودەیە بۆت دەرکەوت، کە دین هەر بریتی نییە لە ڕاپەڕاندن و جێبەجێکردنی چەند وتە و کردارێکی دیاری کراو، بەڵکو بریتییە لە عەقیدەیەکی پاك و بێ گەرد بێگومانی نێو دڵ و ڕەفتار کردن بە پێداویستیەکانی ئەم دینە.

دین هەر ئەوە نییە، کە تەنیا ژیانی تاکەکان بگرێتەوە و واز لە ژیانی کۆمەڵایەتی و سیاسی و ئابوری بهێنێ، بەڵکو ئەو مەفهومانە هەموی ژەهری ڕژێنی کوفرن، بۆ ئەوانەی ئەمڕۆ بانگەشەی (جیاکردنەوەی دین لە دەوڵەت) دەکەن بەرەو بەو عەقیدە باطلە یان دەدەن بۆ ئەوەی موسڵمانان لە مەیدانی ژیاندا فەرامۆش بهێڵنەوە، بە ئارەزووی خۆیان دەست بنێنە کاروباری دنیا و بە هەوەستی خۆیان حەرام و حەلاڵ دابمەزرێنن!

ئیسلام بۆ ئەوە نەهاتوە ببێتە قالبێکی ڕوت و لە ناو مێشکدا گرد ببێتەوە، بەڵکو بۆ ئەوە هاتوە ژیانی خەڵك ڕاست کاتەوە، خەڵك فێری ژینی ڕاستەقینە بکات، بۆ ئەوە هاتوە پرۆگرامی ژیان بۆ گشت ئادەمیزاد دابڕێژێت.

عەقیدەی موسڵمانان ئەوەیە، کە ئیسلام دین و دەوڵەتە و جیابونەوەیان بۆ نییە، هەر یەکێکیش عەقیدەی پێچەوانەی ئەوە بێ و دەوڵەت بۆ دین نەسەلمێنێ، ئەوا بێگومان لە عەقیدەی ئیسلامی ڕەسەن لایداوە.

ئەوانەی بەرەو عەقیدەی (جیاکردنەوەی دین لە دەوڵەت) دەدەن با لایان ڕون بێت، کە ئەوانە بونەتە ئەڵقەلەگوێی جولەکەکان، چونکە ئەوان بون بۆ یەکەم جار ئەم بیرەیان بەرجەستە کرد، دایان هێنا و هەوڵی هێنانەوەی ئەم بیرەیان دەدا، ئەوەتا لە ساڵی (١٩٠٤) لە گۆڤاری (ئەکاسیا) ماسۆنیەکان دەڵێن: (هەوڵدان و خەبات لە دژی دینەکان ئەوکاتە کۆتایی پێدێ، کە دین لە دەوڵەت جیا دەکرێتەوە).

کەواتە ئەم بیرە شتێکی بێگانە و نامۆیە لە عەقیدەی ئیسلامیدا بە هیچ شێوەیەکیش جێگەی ئەم بیرە نابێتەوە، هەمو زانایانی ئیسلامی لەسەر ئەوە یەکدەنگن کە خیلافەت بۆ ئەوەیە کاروباری دین و دنیا هەڵسوڕێنێت.

ئەو کەسانەش، کە برەو بە بڵاوکردنەوەی ئەم بیرە دەدەن هەر هەمان کوفری پێشینانیان بە با دەکەنەوە، ئەوەتا خەڵکی (مەدیەن) بانگەوازی (شوعەیب) پێغەمبەریان لە لا سەیرە! چۆن توخنی کاروبارێك دەکەوێت و قسەی لەسەر دەکات، کە بۆی نییە، با هەر نوێژ بکات و چۆنی دەیەوێت، با بە ئارەزووی خۆی خوا بپەرستێت، بەڵام نابێت باس لە کاری سیاسەت بکات، نەخێر دەبێت باسی نەکات! و خۆی لێ بێ دەنگ بکات.

چۆن دەبێت دین و سیاسەت تێکەڵ بکات: ﴿ قَالُواْ يَٰشُعَيۡبُ أَصَلَوٰتُكَ تَأۡمُرُكَ أَن نَّتۡرُكَ مَا يَعۡبُدُ ءَابَآؤُنَآ أَوۡ أَن نَّفۡعَلَ فِيٓ أَمۡوَٰلِنَا مَا نَشَٰٓؤُاْۖ إِنَّكَ لَأَنتَ ٱلۡحَلِيمُ ٱلرَّشِيدُ ﴾[1].

واتە: دەیانگوت: ئەی شوعەیب ئەرێ ئەوە نوێژەکەت فەرمانت پێ دەکات، کە واز لەوە بێنین، کە باب و باپیرانمان دەیان پەرست یان شتێك بکەین لە ماڵ و سامانماندا کە خۆمان حەزمان لێیەتی؟

ئەمە ڕێبازی کوفرە یەك هەڵوێست و یەك کۆششە لە بەرامبەر ئیسلامدا، لەو سەردەمەی ئێمەشدا کەسانی وا هەن و دەڵێن: کاکە ئێمەش موسڵمانین، ئەوەتا لە دەستوردا ئازادی عەقیدە بەندی بۆ کراوەتەوە و شتێکی ڕەوایە، هەروەها بایەخ بە دروستکردنی مزگەوت دەدەین و سەرپەرشتیان دەکەین، خۆ کەسیشمان لە نوێژ و ڕۆژوو و حەج و زەکات مەنع نەکردوە، بەڵام هەرگیز ڕێگە نادەین پیاوە ئایینیەکان نزیکی سیاسەت و کاروباری حوکم گێڕان بکەونەوە.

---

١ـ هود/٨٧.

برایانی بەڕێز، دە ئێوەش هەوڵ بدەن ئەو جۆرە بیروباوەڕانە لەباربەرن، ئەم تێکۆشانەی، کە دەکرێت لەو پێناوەشدا بیپوکێننەوە و خوای گەورەش پشتیوانی باوەڕدارانە.

### وانەی دەیەم:

عن ابي العباس سهل بن سعد الساعدي ﷺ قال: مرّ رجل على النبي ﷺ فقال لرجل عنده جالس: ما رأيك في هذا؟ فقال: رجل من أشراف الناس، هذا والله حري ان خطب ان ينكح وان شفع ان يشفع، فسكت رسول الله ﷺ. ثم مرّ رجل آخر فقال رسول اللهﷺ: ما رأيك في هذا؟ فقال: يا رسول الله هذا رجل من فقراء المسلمين، هذا حري ان خطب لا ينكح وشفع لا يشفع، وان قال ان لا يسمع لقوله، فقال رسول اللهﷺهذا خير من ملء الارض مثل هذا...[1]...

واتە: سەهل - خوا لێی ڕازی بێ - فەرموی: پیاوێکی دەوڵەمەند لە لای پێغەمبەرەوەﷺڕەت بوو، فەرمووی بە پیاوێکی تر: ئەم پیاوە چۆنە بە لاتانەوە؟ گوتی: ئەوە پیاوێکی خانەدانە بە خوا ئەوە شایستەی ئەوەیە، ئەگەر داوای ژن بکات ژنی بدرێتێ، ئەگەر تکایەك بکات، تکای بگیرێ، ئەگەر قسەیەك بکات گوێ بۆ قسەکەی شل بکرێت، پێغەمبەریش ﷺ بێ دەنگ بو تاوەکو پیاوێکی هەژار لە موسڵمانان لەوێوە ڕەت بو، فەرموی: ئەدی ئەو پیاوە چۆنە بەلاتانەوە؟ گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا! ئەوە پیاوێکە لە هەژارانی موسڵمانان، ئەوە هەقی وایە، کە ژنی پێ نەدرێ، تکای نەگیرێ، گوێ لە قسەی نەگیرێ. پێغەمبەرﷺ فەرموی: دەسا ئەوەیان باشترە لە پڕ زەوی لە وێنەی ئەوی دیکەیان.

---

١ـ متفق عليه.

**ڕاڤەی فەرموودەکە:**

١. ڕاستگۆیی هاوەڵانی پێغەمبەرﷺ کە دەبینین زۆر ڕاستگۆ بون لە بەردەم هەمو واقیعێکدا، چونکە لە ڕاستیدا ئەوەیان زۆر لا ڕوون و ئاشکرا بوە، ئەگەر بێت و ئەوان بە زمان ڕاستیش نەڵێن، ئەوا خوای گەورە بە زویی پێغەمبەری ئاگادار دەکردەوە بە نیەتی دڵیان ئەمە لە لایەك، لە لایەکی دیکەشەوە ئەو هەستەیان تێدا دروست ببو، کە خوای گەورە ئاگادار و چاودێرە بەسەر هەمو نیەت و کردارێکیاندا، جا بۆیە ڕاستگۆ بون بەوەی، کە دەوڵەمەند بە چ چاوێك سەیری دەکرێ هەژاریش، بە چ چاوێك سەیری دەکرێت.

٢. چارەسەرکردنی هەمو تەنگ و چەڵەمەیەك، کە کۆمەڵگا توشی بوبێت، بە جۆرێك زۆر لێزانانە، لەبەرئەوەی هەرکاتێك پێغەمبەرﷺ ویستبێتی چارەسەری هەڵە و نارێکییەکی موسڵمانان بکات، بە شێوەیەکی زۆر حەکیمانە چارەسەری کردوە نموونەی ئەوەش فەرمودەکەی سەرەوەیە، کە پێغەمبەرﷺ زانیویەتی گیرۆدەی ئەوەن کە جیاوازی دەخەنە نێوان هەژار و دەوڵەمەندەوە، جا بۆچارەسەری ئەوەش هاتووە بە شێوەی پرسیار لێ کردن چونە پێشەوە لێیان، تاوەکو بزانێت ئایا بۆچونی ئەوان چۆنە بۆ ئەو مەسەلەیە؟

٣ـ دڵنەوایی کردنی هەژاران و جیاوازی نەخستنە نێوان هەژار و دەوڵەمەندەوە بەوەی، کە لە فەرمودەکەدا باسی لێوە دەکات، کە هەژارێك بە قەدەری پڕی زەوی باشترە لە نموونەی دەوڵەمەندێك، کەواتە قەدر و ڕێز و چالاکی لای خوای گەورە بە دڵی پاك و تاعەت و خێر و چاکەیە نەك بە گەدە و گیپاڵ: (انه ليأتي الرجل السمين العظيم يوم القيامة لا يزن عندالله جناح بعوضة)[١]. واتە: پیاوی گەورە و قەڵەوی وا هەیە لە ڕۆژی قیامەت دەهێنرێ، کەچی کێشی باڵە مێشوولەیەکی نییە لای خوای گەورە.

٤. پێغەمبەرﷺ هەمیشە حەزی بە هاوەڵایەتی و دانیشتن لەگەڵ هەژاراندا کردوە، هەمو کات ڕێزی هەژارانی زیاتر گرتوە، کە ئەمەش بەڵگەیە

---

١ـ متفق عليه.

لەسەرئەوەی، کە گوێڕایەڵی زیاتری خوای گەورە بو، کە خوای گەورە داوای کردوە هەمیشە هاوڕێیەتی هەژارە خواناسەکان بکات، خۆی بەند بکات بە هاوڕێیەتی ئەوانەوە، ئەوانەی بەیانیان و ئێواران عیبادەتی خوا دەکەن، تەنها بۆ ڕازی بونی خوا نەك بۆ سودی دنیایی، داوای لێ دەکات، کە چاو نەبڕێتە هاوڕێیەتی کەسانی دیکە.

﴿وَٱصْبِرْ نَفْسَكَ مَعَ ٱلَّذِينَ يَدْعُونَ رَبَّهُم بِٱلْغَدَوٰةِ وَٱلْعَشِيِّ يُرِيدُونَ وَجْهَهُۥ ۖ وَلَا تَعْدُ عَيْنَاكَ عَنْهُمْ﴾[١].

واتە: بە ئارام بە لەگەڵ ئەوانەی لە خوا دەپاڕێنەوە بە بەیانیان و ئێواران و مەبەستیان ڕەزامەندی خوایە، چاوت لێیان مەبڕە.

٥ـ پێویستە هەژار بە نەبونی خۆی دڵخۆش بێت و ڕازی بێت، کە خوای گەورە لە ڕێزی هەژاراندا dایناوە، هیچ کاتێك بێ تاقەتی ڕوی تێنەکات بەهۆی نەبونی خۆی، چونکە ئەگەر کاتێك ئێمە سەیری ژیانی پێغەمبەران و خواناسان بکەین، دەبینین بەزۆری لە ڕیزی هەژاراندا بون و بە هەژاریش دینی خوایان دەبرد بەڕێوە.

٦ـ نابێت موسڵمانی ڕاستەقینە بەو جۆرە بێت، کە گوێ بۆ کەسێکی هەژارو بێ نەوا نەگرێ، یان داوای قبوڵ نەکات، یان بۆ مەسەلەی ژن و ژن خوازی گوێی پێ نەدرێ، بەڵام بە پێچەوانەوە کەسێکی دەوڵەمەند هەمو قسە و داوایەکی قبوڵ بکرێت، بە ڕێزەوە بۆی بڕوانرێت، چونکە قەدر و ڕێز و چالاکی لای خوای گەورە بە ماڵی زۆر نییە، کەواتە دەبێ ئێمەش وەکو پێغەمبەرﷺ وابین، کە چۆن بە چاوی ڕێزەوە ڕوانیویەتییە هەژاران و بە چاوی سووك تەماشای نەکردوون.

---

١ـ الكهف/٢٨.

٧. پێویستە موسڵمانی هەژار قەناعەتی بە هەمو شتێك هەبێت، ئەگەر ئەو شتەش زۆرکەم بێت، ملکەچ نەکات، بۆ دەوڵەمەند لە پێناوی دەوڵەمەندی دا، هیچ کاتێك حەز بە دانیشتن نەکات لە گەڵیاندا.

وقال ﷺ لعائشة رضي الله عنها :(إياك ومجالسة الأغنياء)[1].

واتە: پێغەمبەرﷺ بە عائیشەی فەرمو: خۆت بپارێزە لە هاونشینی دەوڵەمەندان.

٨. هەژارێك، کە موسڵمان بێت پێویستە نەبونی لە تاعەت و عیبادەتی کەم نەکاتەوە، بەڵکو دەبێت زیاتر سوپاسی خوای گەورە بکات، داوای سەبر لە خوا بکات لەسەر نەبونی، چونکە پێغەمبەرﷺ ئەم مژدە خۆشە بە هەژاران دەدات، کە هەژار پێنج سەد ساڵ پێش دەوڵەمەند دەچێتە بەهەشتەوە (يدخل الفقراء المؤمنون الجنة قبل أغنيائهم بخمس مائة عام)[2].

٩. دەبێت هەژار هەمیشە کۆڵ نەدات لە هەوڵ و کۆششی خۆی، ساردی رووی تێنەکات بەوەی هەوڵ بدات رزق و رۆزی پەیدا بکات، پشت بە خوا ببەستی و داوای رزقی حەڵاڵ لە خوای خۆی بکات، سکاڵای دڵی خۆی بەس تەنها لای خوای گەورە بکات، نەك لە لای خەڵك.

---

١. رواه الترمذي.
٢. قال الترمذي حديث صحيح.

# بەشی ( ٨ )

# فیقهی بانگەواز

## پێشەکی:

### پەیوەندی بون بە خواوە لە ژیانی بانگەوازدا

پەیوەندی بون بە خواوە یەکێکە لە پێویستیە هەرە گەورەکانی بانگخواز، پەیوەندی بون بە خواوە خۆراکێکە بە گوێرەی ئەرکی سەرشانی ئەو بانگخوازە، ئەو کەسانەی دەیانەوێت ئەرکی گەورە هەڵبگرن و خەڵکێکی مردوو زیندوو بکەنەوە، پێویستە چاو ببڕنە ژیانی بانگخوازە هەرە گەورەکانی رێگەی خوا، بۆ ئەوەی بێزار نەبن و ماندوو نەبن لە گەیاندنی ئەرکەکانی سەرشانیان، هەروەکو پێشەوای گەورەمان لە ناڕەحەتترین کاتی بانگەوازدا فەرموی: ((اللهم إنْ لمْ تكن بك عليَّ غضب فلا أبالي)).

واتە: خوایە ئەگەر تۆ لێم تورە نەبی من گوێ نادەمە هیچ ئازار و ناڕەحەتیەك. بزانین بانگخوازانی رێگای خوا ژیانیان لەسەر چی ڕاهێناوە، تاکو لە کاتی ڕوبەڕوبونەوە لەگەڵ نەفامیدا ماندوو نەبن.

یەکێك لەوانە پێغەمبەرداودە (علیە السلام)، کە خوای گەورە دەربارەی دەفەرموێت: ﴿ٱصْبِرْ عَلَىٰ مَا يَقُولُونَ وَٱذْكُرْ عَبْدَنَا دَاوُۥدَ ذَا ٱلْأَيْدِ إِنَّهُۥٓ أَوَّابٌ ﴿١٧﴾ إِنَّا سَخَّرْنَا ٱلْجِبَالَ مَعَهُۥ يُسَبِّحْنَ بِٱلْعَشِىِّ وَٱلْإِشْرَاقِ ﴿١٨﴾ وَٱلطَّيْرَ مَحْشُورَةً كُلٌّ لَّهُۥٓ أَوَّابٌ﴾[1].

---

١ ـ ص/١٧_١٩.

واتـە: (بـە ئـارام بـە لەسـەر ئـەو شـتانەی، کـە دەیڵـێن و، باسـی بەنـدەی خاوەنپایە (داود) بکە، کە خاوەن هێز و، کۆشش بو بۆ بەرگری لە دیـنی خـودا، بـە ڕاسـتی کەسـێکی زۆر گـەڕاوە بـو، بـۆ لای خـوای خـۆی، بـێ گومـان ئێمـە کێوەکانمان بۆ ڕام کردبو، تا بەیانی و ئێوارە تەسبیحاتی خودای لەگەڵدا بکەن، پەلەوەریشمان لە هەمو لایەکەوە بۆ کۆ کردبـۆوە و، هـەمویان دەگەڕانـەوە لای ئەو....

بڕوانە چۆن داود (علیه السلام)، کە دەستی کردوە بـە زیکـر و، یـادی خـوای گـەورە لەگـەڵ شـاخ و کێوەکـان لـە بـەیانیان و ئێـواران، هـەروەها کۆبونـەوەی باڵندەکان بۆ یادی خوای گەورە لەگەڵیدا شـوێنەوارێکی وای بـوە، خـوای گـەورە فـەرمان دەکـات بـە پێغەمبـەر(صـلی اللـه عیلـه وسـلم)، چـاو بکـات لـە (داود) پێغەمبــەر(علیــە الســلام)، یــادی خــوای گــەورە چــۆن مانــدووبونی دادگــا و (محکەمەی) لە بیری داود بردۆتەوە، هەروەها بانگخوازیش پێویستە چـاوی تـێ بېڕن (فَبِهُدَىٰهُمُ ٱقْتَدِهْ)[1].

واتە: پەیڕەوی بکە لە ڕێنمایی و ڕەوشتەکانی ئەوان و شوێنیان کەوە.

- یان سەرگوزەشتەی ئیبراهیم (علیه السلام) چاکترین نمونـەی تێدایـە، کـە پێویستە بخرێتە پیشانگای بانگخوازانەوە و ناوبەناو چاوی پێدا بگێـڕین، وەکـو خوای گەورە دەفەرمویێت: (وَٱتَّخَذَ ٱللَّهُ إِبْرَٰهِيمَ خَلِيلًا)[2].

واتە: ئەم خۆشەویستییە وای لە پێغەمبـەرئیبراهیم (علیـە السلام) کـردوە گوێ نەدات بە ئاگر و سەربڕینی جگەرگۆشەکەی لە ڕێگـەی خـوادا. یـان ژیـانی عیسا (علیه السلام) باشترین سەرچاوەی هێـزە بـۆ ئەوانـەی لـە ڕێگـەی دووردا مانــدوو دەبـن وەك خـوای گـەورە دەفـەرمویێت: (وَكَلَّمَ ٱللَّهُ مُوسَىٰ تَكْلِيمًا)[3].

واتە: خوای گەورە قسەی لەگەڵ موسادا بە دوان و قسە کردن.

---

١ـ الانعام/٩٠.

٢ـ النساء/١٢٥.

٣ ـ النساء/١٦٤.

بێ گومان ساتەکانی گفتوگۆ لەگەڵ پەروەردگاردا وا لە موسا دەکات (علیە السلام) کە ڕێگەی دوور ماندووی نەکات، یان لە کاتێکدا خوای گەورە پێغەمبەری(صلی اللە علیە وسلم) هەڵبژارد، نەیفەرموو بڕۆ شارەزای شارستانیەت و باوو نەریتی عەرەب ببە، یان عیلم و فەلسەفە فێر ببە، هەرچەندە ئەمانەش پێویستی ڕێگەن، بەڵکو فەرمووی ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلۡمُزَّمِّلُ ١ قُمِ ٱلَّيۡلَ إِلَّا قَلِيلٗا ٢ نِّصۡفَهُۥٓ أَوِ ٱنقُصۡ مِنۡهُ قَلِيلًا ٣ أَوۡ زِدۡ عَلَيۡهِ وَرَتِّلِ ٱلۡقُرۡءَانَ تَرۡتِيلًا ٤ إِنَّا سَنُلۡقِي عَلَيۡكَ قَوۡلٗا ثَقِيلًا﴾[1].

واتە: ئەی ئەو کەسەی خۆت حەشار داوە لە ناو بەرگ و پۆشاکدا، لە شەودا هەستە بۆ شەونوێژ و تەنها ماوەیەکی کەم نەبێت، ئەو ماوەیەش نیوەی شەو بێت و، نیوەکەی تریش بۆ خۆت، یان نیوەکەی خۆت کەمێکی زیاد و لە نیوەکەی دیکە و بەشی شەو نوێژەکە کەمتر بێت، لە شەونوێژەکەتدا قورئان بخوێنە بە ئارامی و لەسەر خۆ و جوانی، چونکە بێ گومان ئێمە لەمەودوا وتە و بارێکی قورس دەخەینە سەر شانت (کە قورئانی پیرۆزە)، لەبەر ئەوەی ئەرکێکی ئاوا هێزی دڵ و نورانیەتی روحی دەوێ ئەویش بە یاد و زیکری خودا دەبی و شەونوێژیش لەو یادانەیە، کە یارمەتی مرۆڤ دەدا بۆ هەڵگرتنی ئەرکی گران.

لە ڕاستیدا پێویستە بانگخوازەکانیش میراتگری پێغەمبەران بن، چونکە ئەرکی سەرشانیان لە توێشوو هەڵگرتندا، وەکو ئەرکی سەرشانی پێغەمبەرانە، بە ( چەکی) پێغەمبەران ڕو بە ڕوی نەفامی ببنەوە.

---

١ المزمل/١_٥.

## وانەی یەکەم: بانگخواز (الداعي)

### أ ـ لە ڕەوشتەکانی بانگخواز :

لـە ڕەوشـتە بـە نـرخ و گرنگـەکانی موسـڵمان بـە گشـتی و بـانگخوازان بـە تایبەتی وریا بونە لە قسە وەرگرتن و گەیاندنی، دڵنیا بونە لەو هەواڵانـەی کـە بڵاو دەکرێنەوە، یان لەو باس و خواسانەی کە لە ناو کۆمەڵدا دەکرێن.

لە کاتی وەرگرتنی گوفتارێکدا یان گەیانـدنی پێویسـتە پەیوەسـت بێـت بـەم بنچینانەی خوارەوە تا توشی هەڵە نەبین لـە دنیـادا و سـزاکەی وەرنـەگرین لـە قیامەتدا بەهۆی زمان و نەزانینەوە:

١ ـ  پێویستە ئاگامان لە خاوەنی گوفتارەکە بێت، چونکە ئەمـەش پێچەوانە دەبێتەوە سەر قسـەکە. (يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِن جَآءَكُمۡ فَاسِقُۢ بِنَبَإٖ فَتَبَيَّنُوٓاْ أَن تُصِيبُواْ قَوۡمَۢا بِجَهَٰلَةٖ فَتُصۡبِحُواْ عَلَىٰ مَا فَعَلۡتُمۡ نَٰدِمِينَ)[١].

واتـە:  ئـەی ئـەو کەسـانەی، کـە بڕواتـان هێنـاوە ئەگـەر فاسـق و درۆزنێـك هەواڵێکی بۆ هێنان لێی بکۆڵنەوە، تا باش تێ بگـەن ئـەو هەواڵـە ڕاسـتە، یـان درۆیە، نەوەك گەلێك توشی دەرد و ئازار بکەن بەهۆی نەزانینـەوە و ئـەو کاتـە لە کردەوەی نالەباری خۆتان پەشیمان دەبنەوە، بەڵام ئەو کاتە پەشیمانی سـود نادات.

چونکە قسە و گوفتار پەیوەستە بە دڵ و دەروونەوە، ئەو دەروونە چەند لە خـواوە نزیکـە ئەوەنـدەش قسـەکەی بـێ گومـان لێ کـراوە و متمانـەی دەخرێتـە سەر، بەڵام بە پێچەوانەوە، پێویستە نیشانەی پرسیار بخرێتە سـەر قسـەکە لـە کاتێکدا قسەیەك بە گوێ دەبیستین پێویستە بە چاویش سەیری ڕادەی ڕەوشت و هەڵسوکەوتی خاوەنی قسەکە بکەین.

---

١ ـ الحجرات/٦.

٢ ـ لە کاتی قسە وەرگرتندا پێویستە (تبیان) بەکاربهێنرێت و یەکسەر قسە وەرنەگیرێت و کاری لەسەر نەکرێت، واتە سەرچاوەی قسەکە بزانرێت.

٣ ـ باش ئاگاداربون لە سەرچاوە و بنچینەی گوفتارەکەوە پێویستە رێگەی گەیاندنەکەشی (الراوي) بزانرێت، چونکە زۆر قسە هەن لە سەرچاوەیەکی پاکەوە هەڵقوڵاون، بەڵام تەم و مژی رێگەی پێوە دەنالێ.

٤ ـ لە کاتی گوێ گرتندا دوور کەوتنەوە لە گومانی خراپ (سوء الظن): ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱجْتَنِبُواْ كَثِيرًا مِّنَ ٱلظَّنِّ إِنَّ بَعْضَ ٱلظَّنِّ إِثْمٌ﴾[١].

واتە: ئەی ئەو کەسانەی بڕواتان هێناوە، خۆتان بپارێزن لە زۆربەی گومانی خۆتان بە بڕواداران، چونکە بێ گومان هەندێ گومان گوناه و تاوانە و ڕاست نییە.

پێشەوا غەزالی دەڵێت: ((هیچ کات بۆت نییە گومانی خراپ بەریت بەرامبەر هیچ کەسێك بە ڕادەیەك نەبێت، کە قسەکە، یان کردارەکە (تأویل) هەڵنەگرێت)).

٥ ـ بڵاو نەکردنەوەی ئەو گومانانەی (چاك یان خراپ)، کە دەبڕێن وە ئیش نەکردن لەسەری، چونکە ئەوە یەکێکە لە نەخۆشیەکانی ناو خەڵکی، کە گومان دەبێتە هەواڵ و گوفتارێك و بڵاو دەکرێتەوە بە ناو خەڵکیدا، پێشەوا شەوکانی ـ ڕەحمەتی خوای لێ بێت ـ دەڵێت: ((هەر کەس قسەیەك یان کردارێك لەسەر گومانی خراپ بنیات بنێت، تاوانبار دەبێت)).

٦ ـ دوور کەوتنەوە لە (تأویل) و تەفسیری قسە، هەمو کات پێویستە حوکم بدەین لەسەر دیاردە ـ ظاهرة ـ ی قسەدا و چەند ڕویەکی بۆ دانەنێین.

٧ ـ لە کاتی قسە کردندا پێویستە ئاگامان لێ بێت قسەکانمان دەرهێنراو (الاستنباط) و تێڕوانین (التصور) نەبن، بەڵکو هەمو سات پێویستە لەسەر

---

١ ـ الحجرات/١٢.

زانســت و دڵنیــایی قســە بکــەین ( وَلَا تَقْفُ مَا لَيْسَ لَكَ بِهِۦ عِلْمٌ ۚ إِنَّ ٱلسَّمْعَ وَٱلْبَصَرَ وَٱلْفُؤَادَ كُلُّ أُو۟لَٰٓئِكَ كَانَ عَنْهُ مَسْـُٔولًا )[١].

واتە: مەکەوە شوێن شتێك، کە زانیاریت پێ نییە و شتێك مـەڵێ، کـە پێـی ئاگادار نی، چونکە بێ گومـان گوێچکە و چـاو و دڵ گشتیان بەرپرسـیارن، یـان شاهیدی لەسەر خاوەنەکەیان دەدەن لە دوا ڕۆژدا.

٨ - زوو حـوکم نـەدان بەسـەر هـیچ قسـەیەکدا، نابێـت لەسـەر بنچـینەی متمانە و خۆشەویستی و برایـەتی و دڵسۆزی حـوکم بـدرێت بەسـەر قسـەکەدا، وەك جارێکیان پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) خالیدی کوڕی وەلیدی نارد، بۆ دڵنیا بون لە دوژمنایەتی (بني المصطلق) وە داوای لێکرد، کە پەلـە نـەکات، یـان وەك (شـەهاب الـدین) دەڵێـت: لـە کتـێبی (آداب القضـاء)دا: ئەگـەر قـازی یـەك ڕاستی حوکمەکەی بۆ دەرنەکەوێت، بۆی هەیە حوکمەکە دوا بخات تا بـۆی ڕون دەبێتەوە.

٩ - نەگەیانـدنی هـەمو قسـەیەك، کـە دەبیسـترێت: ﴿کفـی بـالمرء کـذباً أن یحدث بکل ما سمع﴾[٢].

واتـە: بەسـە بـۆ ئـەوەی پیاوێـك پێـی بگـوترێ درۆزن، کـە هەرچـی بیسـتی بیگێڕێتەوە.

١٠ - پشت بەستن بە بەڵگە و ڕون کردنەوە، لە کـاتی قسـە وەرگرتنـدا، وەك پێشەوا شەوکانی دەڵێت: (زۆر هەڵەیە یەکێك دڵنیا نەبێت لە کار و گوفتارێـك، یان تێڕوانینی نەبێت بۆی).

حەسەنی بەسری (فەتوا دەدات و دەڵێت): شایەتی مـەدە بـۆ وەسـیەتێك، تـا دەخوێنرێتەوە بۆت، شایەتی مەدە بۆ کەسێك، کە نایناسیت.

---

١ - الإسراء/٣٦.

٢ - رواه مسلم.

١١ ـ لە کاتی حوکم دەرکردندا یان ناکۆکییەکدا پێویستە گوێ بۆ هەردوولا بگیرێت بە بێ مەیل کردن بە لای هیچ لایەنێکدا، وەك پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم): کاتێك عەلی کوڕی ئەبو تالیبی نارد بۆ یەمەن پێی فەرموو: ((گەر دوو ناکۆك لەبەر دەستتدا دانیشتن بۆ ڕێکخستنیان گوێ لە هەردوو لا بگرە، تا چاك بۆت ڕون دەبێتەوە، پاشان حوکم بدە))[١].

١٢ ـ وریا بون لە موبالەغە و زیادەڕەوی لە قسەدا، چونکە زۆر جار موبالەغە زۆر کاری گەورەی لەسەر بنیات دەنرێت.

برای ئازیز و بەڕێز! ئەم ڕەوشتە زۆر گرنگە بۆ ئێمەی ئیماندار لەم ڕۆژەدا، کە تەم و مژی دوژمنان هەمو هۆکانی ڕاگەیاندن و بڵاوکردنەوەی داپۆشیوە، پڕوپاگەندە بە جۆرێك زۆر بوە، تاوانبار لە دەست دادگا دەردەچێت و بێ تاوان دەدرێتە بەر لۆمە و توانج و دەستی خراپەی بۆ درێژ دەکرێت، لەبەر ئەوە زۆر پێویستە پەیوەست بین بەم بنچینانەوە و، پەنا بەرینە بەر ئەو یاسایانە، کە زانایانی فەرمودە (علماء الحديث) پشتیان پێ دەبەست بۆ جیا کردنەوەی فەرمودەیەکی هەڵبەستراو (الموضوع)، یان بێ هێز (الضعيف) لە فەرمودەیەکی تەواو و ڕاست بۆ ئەوەی بتوانین هەمو کردار و گوفتارێك جێگە و ڕێگەی خۆی بگرێت....( يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ وَكُونُوا۟ مَعَ ٱلصَّٰدِقِينَ )[٢].

واتە: (ئەی ئەو کەسانەی بڕواتان هێناوە لە خوا بترسن و خۆتان بپارێزن لە بێ فەرمانی خوا و لەگەڵ ڕاستگۆیاندا بن).

---

١ ـ رواه ابو داود والنسائي.

٢ ـ التوبة/١١٩.

### ب ـ پاداشت و وەفا:

مرۆڤ ناتوانێت لە تەنیاییدا بژیەت و، ڕۆژگار لە یەك ساتدا ناوەستێت، ڕۆژان ڕۆژی لە دوایە.

سەرکەوتو ئەو کەسەیە، کە چاکە خوازە و، چاودێری چاکەی خەڵکی نییە، بەڵام بە پێچەوانەوە گەر چاکەی لەگەڵ بکرێت، لە یادی ناچێت و، بۆ هەل دەگەڕێت، کە پاداشتی چاکەکە بداتەوە. نامروەت و بێ هەست ئەو کەسەیە، کە چاکەی خەڵکی لە یاد دەچێت و، بە هانە دەداتە ئەو هەڵوێستانەی بەرانبەری دەکرێت، خراپتریش لەوانە کەسانێکن پاداشتی چاکە بە خراپە دەدەنەوە و، هەمو کات بێ وەفان بەرامبەر دۆست و هاوەڵانیان.

پاداشت دانەوە و، وەفا لەگەڵ چاکە خوازان ڕەوشتێکی سروشتییە لە هەمو مرۆڤێکدا، چونکە دڵەکان خۆشەویستی ئەو کەسانە دەبن، کە چاکەیان لەگەڵ دەکات، بەڵام غەریب نییە، کە کەسانێك هەبن بە خراپەیەك تەمەنێك چاکە بسڕنەوە، بەرچاو ڕەش و بێ وەفا بن بەرامبەر دۆستەکانیان.

ئەمەش یەکێکە لە ڕەوشتە بەرز و بەنرخەکانی بانگخواز، کە پێویستە ڕەچاو بکرێت و لە یادمان نەچێت، وەکو پێغەمبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێت: ((إن أشكر الناس لله عزوجل أشكرهم للناس))[1].

واتە: سوپاس گوزارترین کەس بۆ خوای گەورە ئەو کەسەیە، کە زۆر سوپاس گوزار و بە وەفا بێ بۆ خەڵکی.

یەکەم پلەی وەفا و پاداشت بەرانبەر بەدیهێنەر و ڕۆزی دەرمان دەبێت، ئەو زاتەی، کە ڕێنمایی کردین:

﴿وَأَحْسِن كَمَآ أَحْسَنَ ٱللَّهُ إِلَيْكَ ۖ وَلَا تَبْغِ ٱلْفَسَادَ فِى ٱلْأَرْضِ ۖ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ ٱلْمُفْسِدِينَ﴾[2]. واتە: چاکەکار بە وەك چۆن خوای گەورە چاکەی لەگەڵ تۆدا

---

١ـ رواه أحمد.

٢ـ القصص/٧٧.

کردوە، خراپەکاری مەکە لەسەر زەوی بە ڕاستی خوا خراپەکارانی خۆش ناوێت.

دووەم پلەی وەفا و پاداشتمان دەبێت لەگەڵ پێشەوا و پێغەمبەرمان (صلی الله علیه وسلم) بکەین، کە بوە هۆی ڕزگار بونمان لە نەفامی و نەزانی، ئەویش بە خۆشەویستنی و شوێن کەوتنی ڕێبازەکەی دەبێت.

سێیەم پلەی وەفا و پاداشتمان بەرانبەر بە دایك و باوکە، کە دەبیٚ چاکە و ماندووبونیان پێمانەوە لە یاد نەچێت، لە کاتێکدا کۆرپە و ساوا بوین.

﴿ وَوَصَّيْنَا ٱلْإِنسَـٰنَ بِوَٰلِدَيْهِ حَمَلَتْهُ أُمُّهُۥ وَهْنًا عَلَىٰ وَهْنٍ

وَفِصَـٰلُهُۥ فِى عَامَيْنِ أَنِ ٱشْكُرْ لِى وَلِوَٰلِدَيْكَ إِلَىَّ ٱلْمَصِيرُ ﴾[1].

واتە: ئامۆژگاری ئادەمیزادمان کردوە بە چاکە کردن و خزمەت کردنی دایك و باوکی، بە تایبەت دایکی، کە هەڵی دەگریٚ بە لاوازییەوە لە دوا لاوازییەوە، چونکە هەتا منداڵەکە لە سکیدا بچوکتر بێت ئێشی کەمتر پیٚ دەگات، هەتا گەورەتر بێت، ڕۆژ بە ڕۆژ ئەو دایکە لاوازتر دەبێت و ئازاری لە هەڵگرتنیدا زۆرترە، ماوەی لە شیر بڕانەوەی لە دووساڵدا تەواو دەبێت، خوای گەورە دەفەرموی: جا سوپاسی من بکەوە، سوپاسی دایك و باوکیشت بکە، بەڕێز گرتنیان و خزمەت کردنیان وە سەرەنجام و گەڕانەوەت هەر بۆ لای منە.

پاش ئەوانیش دەبێت، هەرگیز وەفا و سوپاسی مامۆستا و ڕێبەرەکانمان لە یاد نەچێت، وەك عەلی کوڕی ئەبو تالیب(ڕەزای خوای لیٚ بیٚ) دەڵێت: (من

---

١ـ لقمان/١٤.

علمني حرفاً ملكني عبداً) وە مەئمونی کوڕی هارونە ڕەشید دەڵێت: ((چەند ڕێز لە پێشەوا و مامۆستا و باوك بگیرێت هەر کەمە)).

دوا پلەی وەفا و پاداشت بەرامبەر ئەو کەسانەیە، کە چاکە و هەڵوێستی بەرزیان هەبوە، لە گەڵماندا بە تایبەت ئەو کەسانەی بیروباوەڕ پەیوەستی کردووین بە یەکەوە، بۆ نمونە لە کاتێکدا پێغەمبەرموسا(عیلە السلام)ئاوی دەرهێنا بۆ کچەکانی شوعەیب پێغەمبەر(عیلە السلام)دەست بەجێ ڕێزی لێ گیرا و پاداشتی درایەوە: (إِنَّ أَبِي يَدْعُوكَ لِيَجْزِيَكَ أَجْرَ مَا سَقَيْتَ لَنَا) [١].

یاخود پێغەمبەری ئازیزمان(صلی الله علیە وسلم) لە جەنگی بەدردا فەرمانی دا، گەر (هیشامی کوڕی عەمرو، زوهەیری کوڕی ئومەییە و، ئەبو بەختەرتان پێ گەیشت مەیانکوژن، ئەمەش بێ گومان لە پاداشتی ئەوەدا بو، کە ئەو سێ کەسە هەستان بە دڕاندنی ئەو نوسراوەی، کە دابڕینی گشتی تێدا تۆمار کرابو.

یاخود لە پاش کۆتایی هاتنی جەنگی بەدر پێغەمبەر(صلی الله علیە وسلم) فەرمویەی: گەر ((مطعمی کوڕی عدی)) زیندوبایە هەمو دیلەکانم پێ دەبەخشی، ئەمەش بێ گومان لە پاداشتی ئەو هەڵوێستەدا بو، کاتێك پێغەمبەر(صلی الله علیە وسلم) لە تایف گەڕایەوە بۆ مەککە کەس پەنای نەدا ئەو نەبێت.

**برای بانگخواز و هۆشیارم:**

سوپاسی چاك خوازان وەفایە بەرانبەر دۆستان و هاوەڵان، یەکێکە لەو دیاردانەی، کە پێویستە ژیانمانی پێ ڕەنگین بکەین، ببێتە یەکێك لە ڕەوشتە

---

١ ـ القصص/٢٥.

سەرەکییەکانی موسڵمان وەك خوای گەورە داوامان لێ دەکات: (وَلَا تَنسَوُا۟ ٱلْفَضْلَ بَيْنَكُمْ)[١].

هەروەها پێشەوامان زۆر گرنگی داوە بەم ڕەوشتە زۆر جار پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) سەردانی هەندێ بێوەژنی دەکرد، کاتێك لێمان پرسی لە نهێنی ئەم سەردانانەی فەرموی: ئەمانە هاوڕێی خەدیجەی خێزانم بون، ئەو کەسەی چاکەیەکی کەمی بە لاوە بێ نرخ بێت لە هەمو دنیاش ڕازی نابێت، وەك لە فەرمودەیەکدا هاتوە: ((من لم یشکر القلیل لم یشکر الکثیر))[٢].

واتە: کەسێك سوپاسی شتێکی کەم نەکات سوپاسی گەورەش ناکات.

نزمترین پلەی پاداشت و، وەفا کردنە بۆ خاوەن چاکەکە وەك پێشەوامان دەفەرموێت: (من أتی علیکم معروفاً فکافئوه فان لم تجدوا ما تکافئونە فادعوا له حتی تعلموا ان قد کافأتموه)[٣]

بەڵێ...ڕەوشتی وەفا هۆیەکە بۆ پتەو کردنی خۆشەویستی و برایەتی. هێمای یەکگرتن و دۆستایەتیە دەرگایەکە بۆ بنیات نانی کۆمەڵێکی بەهێز و دامەزراو، کە هیچ گەردە لولێکی پڕوپاگەندە نەیپسێنێت، دڵنیا بون و ئارامیە بەرانبەر بە یەکتر، دانانی هەمو مافێکە لە شوێنی خۆیدا، تازە کردنەوەی ڕەوشتێکی بەرزی پێغەمبەرە(صلی الله علیه وسلم)، کە دیاری وەردەگرت و پاداشتی لەسەر دەدا.

## وانەی دووەم: بنچینەکانی بانگەواز و بانگخواز

ئاشکرایە، کە ویستی خوای گەورە وا بوە ئەم ئایینە بە هەوڵ و کۆششی مرۆڤ بڵاو ببێتەوە، دەنا ئەگەر مەیلی لێ بوایە یەکسەر هیدایەتی خەڵکی دەدا

---

١ ـ البقرة/٢٣٧.

٢ ـ رواه احمد.

٣ـ رواه احمد والنسائي وابوداود.

(فَلَوْ شَآءَ لَهَدَىٰكُمْ أَجْمَعِينَ)[١] بـێ ئـەوەی کۆمـەڵێکی زۆر لـە پێغەمبـەران و بانگخوازان بکەونە ناڕەحەتییەوە و زۆر جاریش بە کوشتن بچن، بەڵام دیارە، کە کۆمەڵێك ڕێز لە کۆمەڵێك بگرێت بشیان کاتە مایەی هیدایەتی خەڵکی ئەویش بەهۆی ئەو کۆمەڵەوە، کە باوەڕی پێبێنن و ژیانیان لەسەر بەرنامەکەی ساز بکەن و بانگی خەڵکیش بکەن بۆ سەر ئەو ڕێگایە و ئینجا توشی ناڕەحەتی و دەردەسەریش ببن و ئەو کەسانەش، کە خەمی بانگەوازەکە دەخۆن و دڵیشیان ناڕەحەت دەبێت کاتێك خەڵکی وا سەرگەردان و گومڕا و سەرلێشواون.

ڕێزێکی تایبەتییان لێ نراوە لە لایەن خواوە و دەبێت، ئەمە بە فەزڵی خوا بزانن و بە نیعمەتێکی بزانن، کە شایەنی سوپاس گوزاری بێت.

بۆ ئەوەی ماف سوپاس گوزاری ئەو نیعمەتانەی بەجێهێنا بێت، دەبێ بۆ خوا و لە ڕێگەی خوادا بەکاری بهێنێت، نەك بۆ ناو دەرکردن و شوێن کەتو پەیدا کردن، لە لایەکی تریشەوە، دەبێت بە تەواوی پەیڕەوی لە ئامۆژگارییەکانی قورئان بکەن و ڕێوشوێنی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) هەڵگرن نەك بە ئارەزووی بۆچوین خۆیان بانگەوازی بکەن.

بۆ پەیڕەوی کردنیشیان دەبێت چەند شتێك بزانن دەنا بانگەوازەکەیان کەم و کورت و ڕەنگە هەندێك جاریش زیانبەخش بێت، ئەو شتانەش بریتین لە:

١ـ شارەزا بون لە ئیسلام.

٢ـ زانینی چۆنیەتی بانگەواز کردن، کە لە قورئان و فەرمودەکانی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) و ژیانی پێغەمبەرەوە بۆمان دەردەکەوێت.

٣ـ ناسین و شارەزا بون بەو کۆمەڵانەی، کە بانگەوازەکەیان بە نێواندا دەکەن.

---

١ الأنعام/١٤٩.

٤ـ زانین و شارەزا بونی ئەو شوێن و کاتەی بانگەوازی تێدا دەکەن. جا ئەو کەسانەی بانگەواز دەکەن، تا هەستیان بە لێپرسراوی زیاتر بێت، هەوڵی زیاتر دەدەن بۆ پەرەپێدانی شارەزایی خۆیان دەربارەی ئەو خاڵانەی باسمان کردن بۆ ئەوەی کارەکەیان بە بەرهەم تر و پاداشتەکەیان لە لای خوای گەورە زیاتر بێت.

٥ـ خۆسازدان و خۆپەروەردە کردن و ڕەنگ دانەوەی ئیسلامێکی هەمە لایەنی لە هەمو کاروکردارێکدا بۆ ئەوەی قسەکانی بانگخواز لە دڵی بانگ کراودا جێگیر بێت و، بسەلمێنرێت قسەی دڵە و لە دڵدا ئارام دەگرێت.

هەندێك لە موسڵمان نایانەوێت ملکەچی ئەم ڕاستیە بن و دەیانبینین بانگەواز دەکەن بێ ئەوەی شارەزاییان لە ئیسلامدا هەبێت، ئیدی حەڵاڵ حەرام دەکەن و حەرام حەڵاڵ دەکەن، بێ ئەوەی بە خۆیان بزانن، یان هەندێ شت ناوی بیدعەی لێ دەنێن و بیدعەش نیە، هەندێ شت ناوی سوننەتی لێ دەنێن و سوننەتیش نییە، یان بە ناوی عەقیدەوە هەندێك شت باس دەکەن، کە هەزار ساڵێك لەمەوبەر باس کراوە و پەیڕەوانی هەبوە، وا ئێستا نەك پەیڕەوانی ئەم شتە نەماون، بەڵکو کەسیش هەر ناوەکەشی لە بیر نەماوە.

هەندێکیش لەوانە بە بانگەواز کردنیاندا لە جیاتی پەیڕەوی کردن لە قورئان و چۆنیەتی بانگەواز کردنی لە ڕەفتاری پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) و لە ڕێبازی بانگەواز کردنی، دەبینی بە گوێرەی مەیل و ئارەزووی خۆیان بانگواز دەکەن، عن أنس بن مالك(رضي الله عنه) عن النبي(صلی الله علیه وسلم) قال: (یسروا ولا تعسروا بشروا ولا تنفروا)[١].

پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) دەفەرموێت: (بشروا ولا تنفروا) دەبینین ئەوان خەڵکی دەرەوێننەوە، پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) دەفەرموێت:

---

١ ـ البخاري/رقم/٦٢ كتاب العلم ومسلم رقم/١٧٣٤ كتاب الجهاد.

(يسروا ولا تعسروا) ئەوان هەرچی سەختە ئەوە دەکەنە رەێرەوی خۆیان، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَلَوْ كُنتَ فَظًّا غَلِيظَ ٱلْقَلْبِ لَٱنفَضُّواْ مِنْ حَوْلِكَ﴾[1].

ئەوان بێجگە لە رەقی و زبری لە قسە و کردەوەدا هیچی تریان نییە، هەندێکی دیکە بێ ئەوەی گوێ بدەنە ئەو کات و شوێنەی خەڵکی تێیدا دەژین بانگەوازی دەکەن و لە لای ئەوان هەمو شتێك گوتن و کردنی بۆ هەمو کات و شوێنێك ڕاستە، گرنگ ئەوەیە ئەو شتە هەق بێت، تۆ دەبێ (إقامة الحجة) لەسەر خەڵك بکەی، وەکو شتێك (ئیقامەی حوججە) تەنها بەوە دەبێت، تۆ قسەی خۆت بکە، ئینجا لە هەر کوێ بێت، یان لای کێ بێت، یان کەی بێت گرنگ نییە، لە کاتێکدا ئیمامی عەلی دەفەرموێت: (ليس كل ما يعلم يقال ولا كل ما يقال حضر أهله ولا كل ما حضر أهله حان وقته).

واتە: (مەرج نیە هەمو شتێك، کە دەزانرێت بشێت بۆ گوتن، یان ئەگەر بشێت بگوترێت کەسی خۆی ئامادەیە لایان بگوترێت، یان کاتی خۆی هاتبێت، کە بگوترێت). هەروەها ئیمامی شاطبی دەڵێ: (مەرج نییە هەمو شتێك ڕاست بێت و هەق بێت، شیاوی ئەوە بێت بڵاو بکرێتەوە، هەرچەندە با عیلمی شەرعیش بێت، یان هەر شتێك بێت پەیوەندی بە حەڵاڵ و حەرامەوە بێت، بەڵکو ئەمە بەم شێوەیە دابەش دەکرێت:

١ - هەندێکی پێویستە بڵاو بکرێتەوە، کە ئەویش زۆربەی عیلمی شەرعییە.

٢ - هەندێکی بە هیچ شێوەیەك نابێت بڵاو بکرێتەوە.

٣ - هەندێکی تریش لە شوێن و کات و لای کەسی خۆیدا دەبێ بڵاو بکرێتەوە، بۆ باسکردنی شتێکیش، لە کات و شوێن و لای کەسی خۆیدا هەندێك (ضوابط) دادەنێین، وەکو (سيطرة) وایە ئەو (ضوابط)انەش بریتین لە (شرع) و بەرژەوەندی (مصلحة) و عەقڵ.

---

١ـ آل عمران/١٥٩.

هەر شتێك دەتەوێت ڕایبگەیەنی و باسی بکەیت چەند (ضوابط)ێك هەیە کە ئەمانەن:

بیخەنە بەر ڕۆشنایی شەرع ئەگەر شەرعی بو، هێشتا باسی مەکە، بەڵکو بزانە.

باسکردنی دەبێتە هۆی زەرەر یان سود، ....ئەگەر زەرەری نەگەیاند....

٣ـ بیخەنە بەر ڕۆشنایی عەقڵ و بزانە ئەم شتە عەقڵی هەمو خەڵکی قبوڵی دەکات بۆ ئەوەی لای هەمو کەسێك باس بکرێت، یان تەنها لای کۆمەڵێکی کەم شیاوی باس کردنە، جا دوای ئەم سێ پاڵاوتنە (شرع و مصلحة و عقل) ئەگەر ڕێگەمان بۆ باسکردنی نەدۆزیەوە ئەوە بە گوێرەی بەرژەوەندی شەرعی عەقڵی لێی بێ دەنگ بیت و، بڵاوی نەکەیەوە، ئیمامی (ابن تیمیە) فەتوایەکی هەیە دەربارەی زانا دەفەرموێت: (زانا هەندێك جار ئەمر بە چاکە دەکات و هەندێك جار نەهی لە خراپە دەکات و هەندێك جار ڕێگە بە کردنی شتێك دەدات و هەندێك جار بێ دەنگ دەبێت و، لە ئەمر کردن، یان نەهی کرن و باس کردنی ئەو شتە، وەکو گوتراوە هەندێك شت هەیە وەڵامدانەوەی بێ دەنگ بونە هەروەکو چۆن خوای گەورە لە سەرەتای ئیسلامدا بێ دەنگ بو لە فەرماندا بە هەندێك شت، تا کاتێك ئیسلام سەرکەوت و دەسەڵاتی پەیدا کرد، زاناش وایە لە گەیاندنی هەقدا هەندێك جار گەیاندنی هەق دوا دەخات بۆ کاتی دەسەڵات پەیدا کردن، هەروەکو چۆن خوای گەورە زۆر ئایەت و حوکمی دوا خست، تا کاتێك پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) دەسەڵاتی پەیدا کرد).

هەندێك موسڵمانیش بێ ئەوەی زانیارییەکی دەربارەی ئەو خەڵکە هەبێت، کە بانگەوازیان لە ناودا دەکات، دەست دەکاتە کارکردن بێ ئەوەی دۆست و دوژمن لە یەك جیا بکاتەوە، یان بزانێ هەڵوێستی خەڵك بەرامبەری چییە؟ بۆیە دەبینی لەگەڵ دۆستدا وەك دوژمن ڕەفتار دەکات و خەڵکی لە ئیسلام

دەرەوێنێتەوە و نارەزایی ئەو خەڵکەش دەکەنە بەڵگەیەك بۆ ڕاستی خۆیان و، وا دەزانن، تا خەڵکی زیاتر لێیان ناڕازی بێت، ئەوان زیاتر لەسەر هەقن، چونکە پێغەمبەران بەردباران کراون و گاڵتەیان پێ کراوە و سوننەتی بانگەوازی پێغەمبەران وایە، کە خەڵکی لێیان ناڕازی بن و بەردبارانیان بکەن و گاڵتەیان پێ بکەن.

بونیان هەمیشە بەڵگە نییە لەسەر ڕاستی، یان ناڕاستی تۆ، ئەوەتا قورئان خەڵکی دەکاتە چەند بەشێکەوە و سەنگ و ئیعتبارێکی زۆر دادەنێت بۆ ئەو کەسانەی پێیان دەگوترێت جەماوەر، وەکو قورئان دەفەرموێت: ﴿وَمِنْ حَيْثُ خَرَجْتَ فَوَلِّ وَجْهَكَ شَطْرَ الْمَسْجِدِ الْحَرَامِ ۚ وَحَيْثُ مَا كُنتُمْ فَوَلُّوا وُجُوهَكُمْ شَطْرَهُ لِئَلَّا يَكُونَ لِلنَّاسِ عَلَيْكُمْ حُجَّةٌ إِلَّا الَّذِينَ ظَلَمُوا مِنْهُمْ فَلَا تَخْشَوْهُمْ وَاخْشَوْنِي﴾[١].

واتە: لەهەر کوێیەك بون ڕو بکەنە کەعبە بۆ ئەوەی خەڵکی بەڵگەیان لەسەر نەبێت مەگەر ئەوانە نەبێت، کە دژتانن، بە هیچ شێوەیەکیش نایانەوێت دواتان بکەن و لێتان ڕازی بن، ئەوا گوێ مەدەنە هەڵوێستیان و هەرچی دەیڵێن با بیڵێن.

لە بواری موناقەشە کردندا لەگەڵ ئەو کەسانەی، کە خاوەن بیروباوەڕێکی جیاوازن دەفەرموێت: ﴿وَلَا تُجَادِلُوا أَهْلَ الْكِتَابِ إِلَّا بِالَّتِي هِيَ أَحْسَنُ إِلَّا الَّذِينَ ظَلَمُوا مِنْهُمْ﴾[٢].

واتە: بە جوانترین شێوە موناقەشە لەگەڵ گاورو جولەکەدا بکەن، تەنها ئەوانەیان نەبێت، کە دژایەتیتان دەکەن وە نایانەوێت دانتان پێدا بنێن (الَّذِينَ ظَلَمُوا مِنْهُمْ) واتە (ظلموا أنفسهم بالعناد و رفض الإرشاد)، بەڵام ئەوانەی، کە هیواتان پێیان هەیە، ئەگەر ڕاستییان بۆ دەرکەوێت دواتان دەکەون بە

---

١ـ البقرة/١٥٠.

٢ـ العنكبوت/٤٦.

جوانترین شێوە موناقەشەیان لەگەڵدا بکەن.

دەبینین لێرەدا خوای گەورە خەڵکی دەکاتە سێ چینەوە:

- چینی یەکەم: موسڵمانان و ئەوانەی لایەنگری ئیسلامن و حەزیش بەسەرکەوتنی دەکەن و هەوڵی بۆ دەدەن.

- چینی دووەم: ئەوانەی ڕقیان لە ئیسلامە و دژایەتی دەکەن هیچ هەلێك لە کیس نادەن بۆ بەرهەڵستی کردن و لێدانی ئیسلام هەڵگرانی و ناشیرین کردنی.

- چینی سێیەم: زۆربەی کۆمەڵانی خەڵکن و لە نێوان ئەم دوو بەشەدان، ئەوانیش هەموویان یەك بۆچون و هەڵوێستیان نییە، بەڵکو هەندێکیان خۆیان بە موسڵمان دەزانن، بەڵام لایەنگری موسڵمانان نین و گومانیان لێیانە و هەندێکیشیان ڕقیان لە ئیسلام هەیە، بەڵام دژایەتی ناکەن، جا ئەم سێیەمە مەیدانی بانگەوازی ئێمەیە و بەرپرسیارین لەوەی وێنەیەکی جوانی ئیسلامیان نیشان بدەین و ئیسلام خۆشەویست بکەین لە دڵیاندا و قەناعەتیان پێ بکەین بە ڕاستێتی بەرنامەی خوا و خواروخێچی بەرنامە و ڕێچکەکانی دیکەی دەستکردی مرۆڤ.

چینی دووەمیش، کە دژایەتیمان دەکەن زۆر بە پەرۆشەوەن هەڵەیەکی ئێمە، یان ڕەفتارێکی ناشیرینی ئێمە ببیننەوە بۆ ئەوەی لەبەرچاوی خەڵکی ناشیرینمان بکەن و ئەو خەڵکەمان لێ بڕەوێنەوە. زۆریش دڵیان خۆشە بەو موسڵمانانەی، کە بۆچون و ڕەفتاریان ناواقعییە.

چونکە دوژمنانی ئیسلام هەتا لە ئەمریکا و ئەوروپاش زۆر دڵیان خۆشە بەو لاوانەی کە بە وشکی لە ئیسلام گەیشتون و تێگەیشتنەکەیان کاڵ و کرچە.

خودا و پێغەمبەریش(صلی اللە علیە وسلم) لە قورئان و سوننەتدا ئاماژەیان بۆ ئەو ڕاستییە کردوە و موسڵمانانیان وریا کردۆتەوە، کە چ ئەرکێکیان لەسەر شانە.

خـوای گـەورە دەفـەرموێت: ( وَكَذَٰلِكَ جَعَلْنَٰكُمْ أُمَّةً وَسَطًا لِّتَكُونُوا۟ شُهَدَآءَ عَلَى ٱلنَّاسِ وَيَكُونَ ٱلرَّسُولُ عَلَيْكُمْ شَهِيدًا )[١].

پێغەمبەریش(صلی الله علیه وسلم) ئیسلام دەشوبهێنێت بـە قەلایـەك، یـان سەربازگە (معسکر)ێك، کە چەند کەلێنێکی تێدا بێـت، پێویستی بـە پاسـەوانی کـردن هـەبێت و هـەر موسـڵمانەش پاسـەوانی یـەکێك لـەو کەلێنانـە بێـت. بـۆ ئەوەی نەهێڵێت دوژمن لە لای ئەوەوە بێتە ژوورەوە:

(إنما أنت علی ثغرة من ثغور الاسلام فلا یؤتین من قبلك).

واتە: تۆ لەسەر کەلێنێکی لە کەلێنەکانی ئیسلام، ئینجا وریا بـە بـا دوژمـن لە لای تۆوە نەیەتە ژوورەوە.

لـە بەرامبـەر ئـەم بەرپرسیارییەشـەوە خـوا پاداشـتی زۆر گـەورەی بـۆ ئـەو کەسانە داناوە، کە دەبنە مایـەی هیدایـەت دانـی خـەڵکی، پێغەمبـەر(صـلی الله علیه وسلم) دەفەرموێت: (لـئن یهـدي الله بـك رجـلاً واحـداً خـیر لـك مـن حمـر النعم)[٢] .

واتە: ئەگەر خوای گەورە هیدایەتی کەسێك بدات لەسـەر دەسـتی تـۆ، ئـەوە بۆ تۆ باشترە لە قافڵەیەکی گەورەی وشتری سور، کە چاکترین جۆرن لە وشتر.

موسڵمانیش چۆن دەبێتە هۆی هیدایەتی دانی کەسێك:

دیارە یان بەوەی کاربکاتە سەر مێشکی و ئیقناعی بکات بە ئیسلام، یـان کـار بکاتـە سەر دڵ و دەروونی و ئیسلام و موسڵمانان خۆشەویست بکاتەوە لە دڵیـدا و، هەسـت و دەروونـی بـەرەو ئیسـلام ڕابکێشـێت، ئـەوەش بـە قسـەی شـیرین و ڕەفتاری جوان دەبێت.

هەروەها بە هەمان شێوە دەتوانێ بە قسەی ڕەق و ڕەفتاری ناشیرین خەڵکی

---

١ ـ البقرة/١٤٣.

٢ ـ رواه البخاري.

لـە ئیسلام بتۆرێنـێ، یـان بـە شـێوەیەك ڕایبگەیـەنێ، كـە خـەڵك ڕقیـان لێـی ببێتەوە، دیارە زۆربەی خـەڵكی لـەو بابەتانـەن، كـە دەبـێ لـە ڕێگـەی دڵیانـەوە كاریان بكەینـە سـەر هەندێكیشیان لـە ڕێگـەی مێشكیانەوە وەك خـوای گـەورە دەفەرموێت: ﴿ ٱدۡعُ إِلَىٰ سَبِيلِ رَبِّكَ بِٱلۡحِكۡمَةِ وَٱلۡمَوۡعِظَةِ ٱلۡحَسَنَةِۖ ﴾[1].

دەڵێن: (حكمة) بۆ بانگ كردنی عەقڵە و (موعظة)ش بۆ كاركردنە سەر دڵ و دەروونە و (مجادلة)ش بۆ كەسانێك، كە گومانیـان هەیـە و لەسـەر ڕێگاكـەت نـین، دەبیـنین بـۆ (موعظـة) دەفـەرموێت: (الموعظـة الحسـنة) بـۆ (مجادلـة)ش دەفەرموێت: (بالتي هي أحسن).

واتە: بە چاكترین و جوانترین شێوە بۆ ئەوەی لە ڕێگەی دڵیەوە كار بكەیـە سـەر مێشكی. كەواتـە ئێمـە جگـە لـە چینی دووەم، كـە بـە هـیچ شـێوەیەك نیازییـان نییـە گوێمـان لێ بگـرن و بـە هـەمو شـێوەیەك دەیانـەوێ دژایـەتیمان بكەن دەبێ حسابێكی زۆر بۆ ئەو چینانەی تری كۆمەڵ بكەین و، سوریش بـین لەسەر ئەوەی دڵ و هەست و سەرنجیان بەرەو ئیسلام ڕابكێشینەوە. خۆمان بـە لێپرسـراو بـزانین، ئەگـەر هەڵوێسـتیان ڕۆژ لـە دوای ڕۆژ بەرامبـەر ئیسـلام خـراپتر بـو، چونكە ئـەوەیان بەڵگەیـە لەسـەر كـەم و كورتی خۆمـان، ئیـدی چ كەمتەرخی بێت، یـان هەڵـە كـردن بێـت، لـە بانگەوازەكـەدا، هەڵـەش لەوەدایـە كەسانێك بانگەوازی بكەن، كـە شـارەزا نـین، یـان لـە چۆنیەتی بانگـەواز كـردن شارەزا نین، یان ڕەفتاریان جوان نییە و خەڵك ڕەوێنەرەوەن، چونكە بۆ ئەوەی كـار بكرێتـە سـەر مێشكی خـەڵكی دەبێـت كەسـانێك باسـی ئیسـلام بكـەن، كـە شارەزا و تێگەیشتو بن و عەقڵ و حیكمەتیان هەبی و (عاقڵ و دانا) بن. بـەڵام بـۆ كاركردنـە سـەر دڵ و هەسـتی خـەڵكی دەبـێ موسـڵمانان ڕابهێـرێن لەسـەر ڕەوشـتی بـەرز، لـە زمـان پـاكی و قسـە نـەرمی و خـۆگرتن و خزمـەت كردنـی خەڵك و بـە دەنگـەوە چونی لێقـەوماوان و ڕاخسـتنی بـاڵی سـۆز و بـەزەیی بـۆ

١ ـ النحل/١٢٥.

خەڵکی، نەك فیز کردن بەسەریاندا، بەم شێوەیە لە هەردوو بواری بانگەواز کردندا سەرکەوتو دەبین، کە بریتین لە:

بانگەوازی (ناطق) و بانگەوازی بێ دەنگ (الدعوة الناطقة والدعوة الصامتة). بانگەوازی ناطق ئەرکی سەرشانی زانا و شارەزایان و ڕۆشنبیرانی ئیسلامە بە ڕون کردنەوەی ئیسلام و پوچەڵ کردنەوەی هەمو گومان و توانجێك، کە ئیسلام دەگیرێت.

بانگەوازی بێ دەنگ ئەرکی سەرشانی هەمو موسڵمانێکە و لە ڕێگای ڕەوشتی بەرزیەوە خەڵکی بانگ دەکات و، ئیسلام شیرین دەکات. دەربارەی چینی دووەمیش، کە دژایەتی ئیسلام دەکەن دەبێ ئەوە بزانی، کە مەرج نییە هەر هەمویان لەسەر بناغەیەکی بیروباوەڕی و فیکری دژایەتی دەکەن، یان هەمویان یەك پاڵنەریان هەیە، کە فیکرییە، بەڵکو زۆربەیان لە نەفامی و هەندێکیان لە ئەنجامی ڕەفتاری موسڵمانێکەوە، یان کۆمەڵێك موسڵمانەوە دڵیان ڕەنجاوە و ڕقیان هەستاوە لە ئیسلام و موسڵمانان، واتە : هەڵوێستێکی (عاطفي)یە نەك فیکری. ئەم جۆرە کەسانەش کارکردنە سەریان مومکینە لە ڕێگای ڕەفتاری جوان و هەڵوێستی لەبار و شیاوەوە.

خوای گەورە بۆ چۆنیەتی ڕەفتار کردن لەگەڵ ئەم جۆرە کەسانەدا ڕێگەیەکمان پیشان دەدات، کە زۆر کاریگەرە دەفەرموێت: ﴿ٱدۡفَعۡ بِٱلَّتِي هِيَ أَحۡسَنُ ٱلسَّيِّئَةَۚ نَحۡنُ أَعۡلَمُ بِمَا يَصِفُونَ ۝٩٦ وَقُل رَّبِّ أَعُوذُ بِكَ مِنۡ هَمَزَٰتِ ٱلشَّيَٰطِينِ ۝٩٧ وَأَعُوذُ بِكَ رَبِّ أَن يَحۡضُرُونِ﴾[1].

واتە: خراپە بە چاکە لاببە و بەرامبەر شەیتان پەنا ببە بەر خوای گەورە.

هەروەها دەفەرموێت: (وَلَا تَسۡتَوِي ٱلۡحَسَنَةُ وَلَا ٱلسَّيِّئَةُۚ ٱدۡفَعۡ بِٱلَّتِي هِيَ أَحۡسَنُ فَإِذَا ٱلَّذِي بَيۡنَكَ وَبَيۡنَهُۥ عَدَٰوَةٞ كَأَنَّهُۥ وَلِيٌّ حَمِيمٞ ۝٣٤ وَمَا يُلَقَّىٰهَآ إِلَّا ٱلَّذِينَ صَبَرُواْ وَمَا يُلَقَّىٰهَآ إِلَّا

١ ـ المؤمنون/٩٦ـ٩٨.

ذُو حَظٍّ عَظِيمٍ ﴿٣٥﴾ وَإِمَّا يَنزَغَنَّكَ مِنَ الشَّيْطَانِ نَزْغٌ فَاسْتَعِذْ بِاللَّهِ إِنَّهُ هُوَ السَّمِيعُ الْعَلِيمُ ﴾[١]. واتە: چاکە و خراپە یەکسان نابن لە کارکردنیاندا بۆ سەر خەڵکی، تۆ بەرامبەر بە خراپە چاکە بکە، لە ئەنجامدا دەبینی ئەوەی خراپەی لەگەڵدا کردووی و دوژمنتە، دەبێتە دڵسۆزترین لایەنگرت، بەرامبەری دوژمنە شەیتانەکانیش پەنا بەرە بەر خوا، خوا خۆی هەمو شتێك دەبیستێت و بە هەمو شتێك زانا و ئاگادارە.

لە شوێنێکی تردا خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ خُذِ الْعَفْوَ وَأْمُرْ بِالْعُرْفِ وَأَعْرِضْ عَنِ الْجَاهِلِينَ ﴿١٩٩﴾ وَإِمَّا يَنزَغَنَّكَ مِنَ الشَّيْطَانِ نَزْغٌ فَاسْتَعِذْ بِاللَّهِ إِنَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ ﴾[٢].

واتە: لە رەفتاردا لەگەڵ خەڵکیدا ئەوەی لە تواناتدا هەیە و ئاسانە بۆیان و سوکە لەسەریان لێیان وەرگرە و قەبوڵی بکە. فەرمانیش بەوەی چاکە بکە و خۆت لە نەفامەکان لابدە و ئاوڕیان لێ مەدەوە، ئەگەر شەیتان ویستی لات بدات پەنا ببە بەر خوا، خوا خۆی دەبیستێت و زانا و ئاگادارە.

دەبینی لەو سێ کۆمەڵە ئایەتەدا خوای گەورە رێ بە موسڵمانان نیشان دەدات، کە چۆن رەفتار لەگەڵ دوژمنەکانیاندا بکەن، شەیتان، کە لێ براوە بۆ خراپە و چاوەڕوانی چاکە و هیدایەت وەرگرتنی لێ ناکرێت، ئەوا پەنا ببە بەر خوا لە پیلانەکانی.

بەرامبەر دوژمنانی ئادەمیزادیش، چونکە ئومێدی خێریان لێ دەکرێت فەرمان دەدان، یان بە چاکەکردن، یان بە لێ خۆش بون، یان بە ئاوڕنەدانەوە لێیان. وا بزانم ئەوەندە بەس بێت بۆ کەسێك بیەوێت سەرە باسێك بزانێت

---

١ ـ فصلت/٣٤.

٢ـ الاعراف/١٩٩_٢٠٠. (١) العفو: السهل على الناس الذي لا مشقة فيه. (٢) العرف: ما تعارف الناس عليه من الخير.

دەربارەی گرنگی ناسینی کۆمەڵانی خەڵك و چۆنیەتی رەفتار کردن لە گەڵیاندا بۆ کارکردنە سەریان و گرنگی هەڵبژاردنی کات و شوێنی گونجاو بۆ گەیاندنی ئەم بانگەوازە بە خەڵکی.

ئێمەش لێرەدا زیاتر بایەخمان بەم دوو لایەنە داوە، چونکە زانینی بەشێکی تەواوکەرە بۆ زانینی ئیسلام و چۆنیەتی گەیاندنی، ئەم بەشە، کە پێی دەگوترێت ناسینی (واقیع) ڕەچاو کردنی بەڵگەیە لەسەر حیکمەت و دانایی، خوای گەورە دەفەرموێت: (....وَمَن يُؤْتَ ٱلْحِكْمَةَ فَقَدْ أُوتِيَ خَيْرًا كَثِيرًا)[١].

تەنها بونی (زانیاری - علم)ی ڕوت بەس نییە، بەڵکو دەبێ بانگەواز حیکمەت و دانایشی هەبێت، کە بریتییە لە گوتن و کردنی هەمو شتێك، کە پێویستە وەکو خۆی لە کات و شوێنێکی پێویستدا.

دەبێ ئەوەش بزانین، کە ئێمە لەم ڕۆژەدا لە بارودۆخێك داین زۆر تایبەتە و میللەتەکانمان بە شێوەیەك لە ئیسلام دوور خراونەوە وێنەی نییە لە مێژوی ئیسلامدا، گەڕانەوەشیان بۆ ئیسلام جارێکی دی ئەرکێکی زۆر قورسە و هەوڵێکی یەکجار زۆری دەوێ، کەسانێکی زۆر بلیمەت و لێ هاتوی دەوێت.

بە ڕاستی لەو ڕۆژەداین، کە پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێت:

(بدأ الاسلام غريبا وسيعود غريبا كما بدأ فطوبى للغرباء)[٢].

ئیتر خۆشی بە حاڵی ئەو کەسانەی، کە لە کاتی غەریبی ئیسلامدا بانگەوازی بۆ دەکەن و ئەو غوربەتە جارێکی دیکە دەڤۆزنەوە و لای خەڵکی ئاشنای دەکەن و بە خەڵکی دەناسێننەوە و هەوڵ بدە لەوانە بی، ئەگەر دەشتەوێ لەوان بی ئەو خاڵانەی لە سەرەوە باسمان کردن پێویستە پەیڕەویان بکەی.

---

١ ـ البقرة/٢٦٩.

٢ ـ رواه مسلم.

## وانەی سێیەم: لە نیگای بانگەوازەوە

### أ ـ دڵ:

کاتێك دەتوانین کار بکەینە سەر زیندوان و دەوروبەر بگۆڕین و وشەکانمان تیشك دار بن، کاتێکیش وشەکانمان زیندوو و ڕوناك دەبنەوە، کە خۆمان لە خۆماندا زیندوو بین.

بانگەوازیش کاتێك زیندووە، کە دڵی هەست بە تام و چێژی ئیمان بکات، کار بکاتە سەر دەوروبەری، هەمیشە سنگ فراوان و دڵنیا بێت و، ڕۆژ بە ڕۆژ لە گەشە و گەورە بونێکی سرووشتیدا بێت...چونکە زۆر بانگخواز هەن، کە جموجۆڵیان هەیە لە مەیدانی کاردا، بەڵام لە ڕاستیدا مردوون هەست بە خۆیان ناکەن.

ـ جارێکیان قوتابیەك لە مامۆستاکەی پرسی، ئایا بۆچی کاتی خۆی خوتبە خوێن و بانگخواز کەم بون بەڵام خەڵك چون بە دەنگیانەوە و توانیویانە کار بکەنە سەر جەماوەر؟ بەڵام ئێستا بە زۆر شوێندا بانگخواز دڵسۆز زۆرن، بەڵام ناتوانن کارێکی ئەوتۆ بکەن لە گۆڕانکاری جەماوەردا؟

مامۆستاکەی وەڵامی دایەوە و گوتی: کوڕم خۆم جاران بانگخوازان زیندوو بون، خەڵکی خەوتبون، زیندووش خەوتو بێدار دەکاتەوە، بەڵام ئێستا بانگخوازان مردوون خەڵکی خەوتون، مردوو چۆن خەوتو بێدار دەکاتەوە؟!

لەبەر ئەوە دەبینین قورئان داوامان لێ دەکات، کە وەڵامی خوا و پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) بدەینەوە، تا زیندوو ببینەوە و ژیانمان پێ ببەخشرێت : ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱسۡتَجِيبُواْ لِلَّهِ وَلِلرَّسُولِ إِذَا دَعَاكُمۡ لِمَا يُحۡيِيكُمۡۖ وَٱعۡلَمُوٓاْ أَنَّ ٱللَّهَ يَحُولُ بَيۡنَ ٱلۡمَرۡءِ وَقَلۡبِهِۦ وَأَنَّهُۥٓ إِلَيۡهِ تُحۡشَرُونَ ﴾[1].

---

١ـ الانفال/٢٤.

- چونکە لە ڕاستیدا کاتێك بانگخواز بێ ئاگایە لە پەروەردگار و غەفڵەت هەمو دەروونی داگیر کردوە، بە مردوو دەژمێردرێت ئەگەر چی بانگەوازیش بۆ لای خوا و یادی خوا بکات، چونکە قسەکانیان لە دڵەوە دەرناچێت، هەر گوفتارێکیش لە دڵەوە نەهات بێ گیانە و ناگاتە دڵەکان وە تەنها لە گوێکاندا جێگەی دەبێتەوە.

دڵێك، کە داپۆشراو بێت بە تەم و مژی خراپە نەخۆش دەکەوێت، ئەم نەخۆشەش ئەگەر خۆراکی بریتی بێت لە (حەرام و تاوان) لە پەل و پۆ دەکەوێت و دەمرێت، چونکە خواردنی تایبەتی دڵ لە کاتێکدا، کە ساغ بێت، یان لاواز بێت یادی خوایە، بەڵام یادێك، کە هەست و فکر و عەقڵ و دەروون تێیدا بەشدار بێت، یادێك، کە بەردەوامی هەبێت، یادێك تەنها مەبەست لە ڕازی کردنی پەروەردگار بێت ئەمەش پێغەمبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) دەست نیشانی دەکات و دەفەرموێت:

(مثل الذي يذكر ربه والذي لا يذكر ربه، مثل الحي والميت)[١].

لەبەر ئەوە دەبینین خوای گەورە زۆر هانمان دەدات لەسەر یادی خۆی، پێویستی دەکات لەسەر شانمان، کە کاتەکانمان پڕ بکەین لە یادی خوا و هەردەم زمانمان پاراو بێت بە یادی خۆیەوە: (يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱذْكُرُوا۟ ٱللَّهَ ذِكْرًا كَثِيرًا ﴿٤١﴾ وَسَبِّحُوهُ بُكْرَةً وَأَصِيلًا )[٢].

( وَٱذْكُر رَّبَّكَ فِى نَفْسِكَ تَضَرُّعًا وَخِيفَةً وَدُونَ ٱلْجَهْرِ مِنَ ٱلْقَوْلِ بِٱلْغُدُوِّ وَٱلْـَٔاصَالِ وَلَا تَكُن مِّنَ ٱلْغَـٰفِلِينَ )[٣].

---

١ـ رواه البخاري رقم/١٩٩٥/كتاب الدعوات، و مسلم/٧٧٩.

٢ـ الاحزاب/٤٢.

٣ـ الاعراف/٢٠٥.

چونکە خوای گەورە زیندووە و یادەکەشی زیندوو کەرەوەی ژیانە و ئاودێرە بۆ دڵە وشك بوەکان. کاتێك وشەکانمان تیشك دار دەبن و دەوروبەری تاریك ڕوناك دەکەنەوە و دەتوانن خۆ بکەن بە ناو دەروونە تێك ئاڵاوەکاندا کاتێك لەگەڵ خوادا بژین دڵمان هەردەم پەیوەست بێت بەوەوە، چونکە یەکێك لە سیفەتە پیرۆزەکانی خوای گەورە (ٱللَّهُ نُورُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۚ مَثَلُ نُورِهِۦ كَمِشْكَوٰةٍ فِيهَا مِصْبَاحٌ ۖ ٱلْمِصْبَاحُ فِى زُجَاجَةٍ ۖ ٱلزُّجَاجَةُ كَأَنَّهَا كَوْكَبٌ دُرِّىٌّ يُوقَدُ مِن شَجَرَةٍ مُّبَٰرَكَةٍ زَيْتُونَةٍ لَّا شَرْقِيَّةٍ وَلَا غَرْبِيَّةٍ يَكَادُ زَيْتُهَا يُضِىٓءُ وَلَوْ لَمْ تَمْسَسْهُ نَارٌ ۚ نُّورٌ عَلَىٰ نُورٍ ۗ يَهْدِى ٱللَّهُ لِنُورِهِۦ مَن يَشَآءُ ۚ وَيَضْرِبُ ٱللَّهُ ٱلْأَمْثَٰلَ لِلنَّاسِ ۗ وَٱللَّهُ بِكُلِّ شَىْءٍ عَلِيمٌ )[1].

(ٱللَّهُ نُورُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۚ) بریتییە لە نووری موسڵمان کاتێك باوەڕ دێنێ بە خوای گەورە و تاك و تەنیا، بریتییە لەو موسڵمانەی، کە ئیمان و قورئانی لە سنگدا هەڵ گرتوە.

(مَثَلُ نُورِهِۦ ) هەندێ لە زانایان (هاء)ەکە دەگێڕنەوە بۆ لای خوای گەورە، واتە ئەو نوورەی، کە خوای گەورە خستویەتیە دڵی موسڵمانەوە، هەندێکی تر لە زانایان (هاء)ەکە دەگەڕێننەوە بۆ ئەو نوورەی لە دڵی موسڵماندا، کە وەك چرایەك وایە لە تاقێکدا.

بەڵام چ ژیانێك و چ لەگەڵ بونێك ئەو نوورە دروستدەکات؟

هەردەم دڵمان بە پەرۆشەوە بێت، بۆ دیتنی و هەردەم حەز و ئارەزوومان بێت، کە کاتەکانمان لە پەرستنی ئەودا بەسەر بەرین، تام و لەزەت وەرگرین لە گفتوگۆ کردن لە گەڵیدا، هیوامان تەنها ڕەزامەندی ئەو بێت و ئاواتمان سەرکەوتن و ڕو سوری بێت لە قیامەتدا. هەرگیز سست و تەمبەڵ نەبین لە بەدی هێنانی ئەرکەکانمان، بە تایبەتی خۆ نزیك کردنەوە و پەرستنی بە

---

١ ـ النور/٣٥.

تـەنهایی و لـە تـاریکی شـەودا، کـە دڵ و دەروونمـان پێـی ڕونـاك و زینـدوو دەبێتەوە.

ـ هۆیـەکی دیکـە بـۆ زینـدوو کردنـەوەی دڵـەکان و پـڕ کردنیـان لـە نـوور بریتییە لە قورئان خوێندن و ئاوێزان بون پێیەوە، چونکە ئـەم قورئانـە خـۆی نووره و نووریش دەبەخشێت بەو کەسانەی لەگەڵیدا دەژین:

(فَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ بِهِۦ وَعَزَّرُوهُ وَنَصَرُوهُ وَٱتَّبَعُواْ ٱلنُّورَ ٱلَّذِيٓ أُنزِلَ مَعَهُۥٓ أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡمُفۡلِحُونَ )[١].

بەڵام بە ئاسانی ناچێتە ناو دڵەکانەوە، تێیدا جێگیر نابێت، تا زەمینـەی بـۆ ساز نەدەین بەو دوو هۆکارەی پێشتر باس کرا.

پاشـان قورئـان دروسـتکەر و هەڵگیرسـێنەری ئـەو نوورەیـە و ئـاودێری دڵ دەکات و هەمیشە وامان لێ دەکات، کە بە ئاگا بین و غەفڵەت ڕومـان تـێ نـەکات (فَذَكِّرۡ بِٱلۡقُرۡءَانِ مَن يَخَافُ وَعِيدِ )[٢].

گەر بەم شێوەیەش بـین ئـەوە هـەردەم زینـدووین و دەبینـە سەرچاوەیەکی نـور، دەتـوانین لـە نـاو زینـدوانـدا بـژین و ڕونـاکی ببەخشـین بـەو خەڵکـە و کەسیش لە ڕوناکی ڕاناکات. (وَمَن لَّمۡ يَجۡعَلِ ٱللَّهُ لَهُۥ نُورٗا فَمَا لَهُۥ مِن نُّورٍ)[٣].

ئینجا بەڕێزتان بـۆ زیـاتر سـود وەرگـرتن سـەرنجی قورئـانی پـیرۆز بـدەن و بزانن چەند ووشەی (قلب) و (فؤاد)ی تێدایە و وورد ئەم ئایەتانـە بخوێننـەوە، کە پەیوەندییان بەم باسەوە هەیە.

---

١ ـ الاعراف/١٥٧.
٢ ـ ق/٤٥.
٣ ـ النور/٤٠.

## ب ـ ڕوناکی شەو:

ئـەوی بێگومانـە رێگـەمان رێگایـەکی سـەخت و دژوار و پـڕ لـە ئـازار و ئەشکەنجەیە، کاروانێکی دوور و درێژ خایەنە..هەمو کـەس توانـای بـڕینی ئـەو رێگایەی نییە، زۆر هەن لە رێگادا داوای لادان و پشوودان دەکەن.

بانگەوازیش پێویستی بە خۆماندوو کردن و خـۆ سـەغڵەت کـردن هەیـە، تـا دەگاتە ئەنجام.

ئەم قۆناغەی، کە ئێستا تێیدا دەژین قۆناغی کێشەی فیکری و ڕۆشـنبیری و سەربازی...یە لەگەڵ دوژمنـدا، ئینجا بێگومـان ئـەو کەسـانەی خـاوەن توێشوو نەبن توانای بەرانبەرکێی نییە و زوو دەپسێت لـە گۆڕەپانـدا بـۆ بـڕینی رێگـای سەخت و بەرزی ئەم بەرنامەیە، بۆ هەستان بە ئەرك و پێویستی سـەر شـانمان بەرانبـەر بـە بانگەوازەکـەمان وە بـۆ پەیـدا کردنـی توانـا و بـۆ ڕوبەڕوبونـەوە لەگـەڵ دوژمنـدا پێویسـتیمان بـە ڕونـاك کردنـەوە و ئـاوەدان کردنـەوەی شـەو هەیە، چونکە لە ڕاستیدا تەنها ئەو کەسانە دەتوانن کار بکەن و مانـدوو نـەبن، ببەخشـن و پەشـیمان نـەبن، ببـزوێن و نەوەسـتن، زینـدوو بـن و نـەمرن، کـە دەرچوی قوتابخانەی شەوو دەورەی شەو نوێژن.

ئەمەش دەمانگەیەنێتە ئەو مەبەستەی، کە خوای گەورە لە سەرەتای نیگادا شەونوێژی پێویست کرد لەسەر پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) و هاوەڵەکانی: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلۡمُزَّمِّلُ ﴿١﴾ قُمِ ٱلَّيۡلَ إِلَّا قَلِيلٗا ﴿٢﴾ نِّصۡفَهُۥٓ أَوِ ٱنقُصۡ مِنۡهُ قَلِيلًا ﴿٣﴾ أَوۡ زِدۡ عَلَيۡهِ وَرَتِّلِ ٱلۡقُرۡءَانَ تَرۡتِيلًا ﴿٤﴾ إِنَّا سَنُلۡقِي عَلَيۡكَ قَوۡلٗا ثَقِيلًا ﴿٥﴾ إِنَّ نَاشِئَةَ ٱلَّيۡلِ هِيَ أَشَدُّ وَطۡـٔٗا وَأَقۡوَمُ قِيلًا ﴿٦﴾ إِنَّ لَكَ فِي ٱلنَّهَارِ سَبۡحٗا طَوِيلٗا﴾[1].

هـەروەها خـاتو عائشـە ـ ڕەزای خـوای لێ بێـت ـ دەڵێـت: (پێغەمبـەری خوا(صلی الله علیه وسلم) لە شەودا هەڵدەستا بۆ نوێژ، تا پێی پیرۆزی شـەق و قڵیشی دەبرد).

١ ـ المزمل/١_٧.

هەستان لە کاتێکدا تاریکی شەو باڵی کێشاوە بەسەر دونیادا و خەڵکی ون بون لە دەریای خەودا..بە تەنهایی و پەنهایی جێ هێشتنی نوێن و بێخەفی گەرم و وازهێنان لە خەوی خۆش و گفتوگۆ کردن لەگەڵ دروستکەر و بەدیهێنەری بونەوەردا گەورەترین نیعمەت و خۆشبەختییە بۆ ئەو کەسەی، کە بەشداری ئەم کاروانە دەکات و، هەوڵ دەدات ئەم هەلەی لە دەست نەچێت.

- شەو نوێژ وێستگای پشووی گشت موسڵمانێکە، کانیاوێکە تینوی چەند ساڵەی پێ دەشکێت، سێبەرێکە ماندووبوی تێدا دەحەوێتەوە، ئاوێکی پاك و پاکژکەرە هەمو تاوان و پیسییەك دادەشۆرێت، بەهارێکە گیانەکان سەوز دەکاتەوە، قوتابخانەیەکە نهێنی زۆری تێدا فێر دەبێت، وەرزشێکە گەورەترین هێزت پێ دەبەخشێت و وا دەکات لە خاوەنەکەی، کە توانای هەمو کێشە کێشێکی هەبێت و زاڵ بێت بەسەر گیروگرفتەکانی ڕۆژانەدا...

بەڵێ لە شەودا چاوەکان بە فرمێسك و دڵەکان بە خۆشەویستی و دەستەکان بە دوعا سارێژ دەبن، هەمو تەنگ و چەڵەمەیەکمان بۆ دەکرێتەوە، چونکە شەو کلیلی کاروباری ڕۆژە و زیاتر ڕۆژ ڕوناك دەکاتەوە، گەر شەو ئاوەدان بکەینەوە بە خۆشەویستی خوا و پێغەمبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) وەك پێغەمبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) دەفەرموێت: (إن في الليل لساعة لا يوافقها رجل مسلم يسأل الله تعالى خيراً في أمر الدنيا والآخرة إلاّ أعطاه إياه وذلك كل ليلة)[1].

ئینجا با ئەوەشمان لە یاد نەچێت، کە شەونوێژ ڕەوشتی سەرەکی پێشینانمان بوە وە گرنگییەکی زۆریان پێ داوە وەك خوای گەورە بۆمان باس دەکات: ﴿كَانُوا۟ قَلِيلًا مِّنَ ٱلَّيْلِ مَا يَهْجَعُونَ ﴿١٧﴾ وَبِٱلْأَسْحَارِ هُمْ يَسْتَغْفِرُونَ﴾[2].

---

١ ـ رواه مسلم.
٢ الذاريات/١٧_١٨.

خوای گەورەش داوای لە پێغەمبەرمان(صلى الله عليه وسلم) کردوە، کە بەردەوام بێت لەسەر ئەم ڕەوشتە بەرزە، تا بگاتە پلەی سەرفرازی و بەرزی خۆی: ﴿ وَمِنَ ٱلَّيۡلِ فَتَهَجَّدۡ بِهِۦ نَافِلَةً لَّكَ عَسَىٰٓ أَن يَبۡعَثَكَ رَبُّكَ مَقَامًا مَّحۡمُودًا ﴾[1].

قیامەت مسۆگەر کردن و ڕزگار بون سزا و تاریکی قەبر تەنها بە ڕوناك کردنەوەی شەو دەبێت وەك یەکێك لە پیاو چاکان پاش مردنی خۆی هاتە خەوی یەکێك لە قوتابیەکانی، پرسی لە حاڵ و وەزعی پاش مردنی، لە وەڵامدا گوتی: تەنها دوو ڕکاتی تاریکی شەو فریامان کەوت.

کەواتە بۆ بەهێز بونمان لە مەیدانی بانگەوازدا، بۆ بەردەوام بونی کاروانی ئیش کردنمان و کەم کردنەوەی هەڵەکانمان وە بۆ گەڕانەوەمان بۆ سەر ڕەوشت و ڕێبازی پێشینانمان پێویستە شەو نوێژ بکەیتە مەشخەڵێك و لە جیهانی واقیعدا بیچەسپێنین بە تایبەتی لەم بارودۆخە ناهەموارەدا پێویستیمان زیاتر بە نزیك بونەوە و پتەو کردنی پەیوەندی هەیە لەگەڵ پەروەردگاردا، تا بتوانین هەمان شێوازی هاوەڵانی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) زیندوو بکەینەوە، کە ناسراو بون بە (رهبان الليل و فرسان النهار) واتە: خواپەرست بون بە شەو وە سوارچاك بون بە ڕۆژ.

### وانەی چوارەم: نەوەیەکی قورئان ڕەفتار و بێ وێنەی ناوازە

دیاردەیەکی گرنگی مێژویی هەیە پێویستە لەسەر هەمو خەمخۆرانی بانگەواز و ڕابونی ئیسلامی هەڵوێستەیەك بکەن. لە بەردەمیدا و لێکی بدەنەوە، بۆچی لە دێر زەمانەوە نەوەیەکی تری بە وێنەی نەوەی هاوەڵ (اصحاب)ەکانی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) دروست نەبونەوە!!

دیارە ئەم دیاردەیەش نهێنییە، کە پێویستە بگەڕێین بە دوایدا بۆ ئەوەی بتوانین بە یارمەتی خوای گەورە، نەوەیەك بە وێنەی ئەوان پەروەردە بکەین

---

١ ـ الاسراء/٧٩.

و پێ بگەیەنین..ئاشکراشە، کە بانگەوازی ئیسلامی کۆمەڵێکی بێ وێنەی وەکو هاوەڵانی پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) ی پەروەردە کرد، کە هەتا هەتایە لاپەڕەکانی مێژو شانازی پێوە دەکات، هەرچەندە پاش ئەوان چەند کەسانێك دروستبون نەك بەو شێوە زۆرییە و لە کات و شوێنی دیاری کراودا. لە کاتێکدا هەمان سەرچاوە، کە (قورئان) و (سوننەتە) لەبەر دەستماندا هەروەکو لەبەر دەستی ئەوەی یەکەمی هاوەڵانیشدا بو، تەنها جیاوازییەك، کە هەبێت لە نێوانماندا و ئێمەی لێ بێ بەش بین ئەوەیە، کە ئەوان پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم)یان لە ناودا بو، بەڵام ئەمڕۆ شەخسی پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) لە ناو ئێمەدا نییە.

ئینجا با بزانین ئایا هۆی نەبونی پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) لە ناوماندا دەبێتە هۆکار بۆ بەرەوپێش نەچون و دروست نەبونی کۆمەڵێکی بێ وێنە و ناوازەی، وەکو کۆمەڵی هاوەڵانی پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) ؟!

ئێمەش لە وەڵامدا دەڵێین: نەخێر: چونکە ئەگەر نەبونی شەخسی پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) ببێتە هۆکار، ئەوا خوای گەورە ئەم قورئانەی نەدەکردە کۆتاترین بەرنامە لەسەر زەویدا و نەی دەکردە بانگەوازێك بۆ هەمو بەرەی ئادەمیزاد و موکەلەف نەدەکرد پێی، ئەگەر خوای گەورە بەهۆی پێغەمبەرەوە بەرنامەکەی ڕاگیر کردبایە و نەیزانیبا دوای پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) بانگەوازەکە بەردەوام دەبێ و بەرهەمی خۆیشی دەدا بە دەستەوە ئەوا بەڵێن (وعد)ی پاراستنی نەدەدا، کە دەفەرموێت: ﴿ إِنَّا نَحْنُ نَزَّلْنَا الذِّكْرَ وَإِنَّا لَهُ لَحَافِظُونَ ﴾[١]..

واتە: بێگومان ئێمە قورئانمان ناردووە و بێگومان خۆشمان دەیپارێزین.

کەواتە: بۆمان دەردەکەوێ کە نەبونی شەخسی پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) نابێتە هۆکار بۆ ئەو مەسەلەیە، چونکە ئەگەر واش بایە ئەوا هەر بە

---

١ ـ الحجر/٩.

نـەمانی پێغەمبـەری خـوا(صـلی اللـه علیـه وسـلم) کۆتـایی بـە بـاس و نـاوی بانگەوازی ئیسلامی دەهات.

جا کە زانیمـان هـۆی دروسـت نـەبونی کۆمـەڵێك بـە وێنـەی ئـەوان نـەبونی شەخسی پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) نییە، پێویستە ورد بینەوە لە چـەند شتێکی تر و چەند هەڵوێستێکی تـری بـێ وێنـە، کـە لەوانـدا هـەبو، بـەڵام لـەم رۆژگـارەدا دەگمەنــە و کــەمتر بەرچـاو دەکـەوێت و ڕەچـاو دەکرێـت، کـە ئـەو شتانەش بریتین لە:

- سەرچاوەی بیر و هۆش و ڕەوشت.
- شێوازی وەرگرتن.
- واز هێنان لە نەفامێتی و جاهیلییەت.

### ١ ـ سەرچاوەی بیر و هۆش و خووڕەوشت:

بێگومـان یەکـەمین سەرچـاوە و بەرنامەیـەك، کـە کۆمـەڵی یەکـەم تێنـوێتی خۆیانیــان لێ دەشــکاند تــەنها قورئــان بــوە. وە فــەرموده و هەڵســوکەوتی پێغەمبەریش(صلی الله علیه وسلم) هەڵقوڵاوی هەمان سەرچاوە بوە. هەروەکو پرسـیار کـرا لـە دایکـی ئیمانـداران خـاتو (عائیشـە) ـ ڕەزای خـوای لێ بێـت ـ دەربارەی خووڕەوشتی پێغەمبەر(صلی اللـه علیـه وسـلم) فـەرموی: (کـان(صـلی الله علیه وسلم) خلقه القرآن)[١].

واتە: خووڕەوشتی پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) قورئان بو.

کە دەتوانین بڵێین: تاکە سەرچاوەی قورئان بـوە: کـە خۆیـان پـێ پـەروەردە بکـەن و بەرنامەڕێـژی ژیانیـان تـەنها لـەوەوە وەردەگـرت، جـا ئـەم گووتەیـەش ئەوە ناگەیەنێت، کە ئێمە بڵێین لەو کاتەدا هیچ جۆرە بیروبۆچونێکی دەرەکـی نــەبوە، تــا کاریــان تــێ بکـات و تێکـەڵی سەرچـاوەکەیان ببێـت و بــە زەحمــەت

---

١ ـ رواه مسلم وأخرجه النسائي.

خۆیـانی لێ بپـارێزن، نـەخێر: چـونکە هـەر لـەو کاتـەدا جۆرەهـا فەلسـەفە و بیروبۆچون دەوری دابون، وەك: (شارستانێتی ڕۆمان)، کـە تـا ئێسـتاش ئـەوروپا لەسەری دەژی، (شارستانێتی ئەغریق و ڕەوانبێژی و فەلسەفە و هونـەری)، کـە تا ئەمڕۆ سەرچاوەی بیروبۆچونی ڕۆژئاوایە و شارستانێتی هینـد و چـین و بـە تایبـەت شارسـتانێتی فـارس و ڕۆم، کـە بـە تـەواوەتی سەرتاسـەری دوورگـەی عەرەبی گرتبووەوە، لەگەڵ ئەوەشـدا جولەکـە و خـاچ پەرسـت لـە نـاو جەرگـەی دوورگەکەدا بون و کاری خۆشیان دەکرد..

کەواتە ناتوانین بڵێین: ئەوان هـیچ جـۆرە لـە شارسـتانیەت و بیروبۆچـونێك دەوری نەدابون! بەڵکو بگرە زیاتریش لە ئەمڕۆ شتی پڕوپووچ و درۆ و...کـاری لەسەر دەورەبەرەکەیان کردبو.

بەڵام پێغەمبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) بە شێوەیەك ڕای هێنـابون کـە تاکە سەرچاوەی بیروبۆچون و خووڕەوشـتیان لـە قورئـان بێـت، بەڵگـەشمان بـۆ ئەم قسەیە ئەوەیە کاتێ پێغەمبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) پارچـەیەك لـە (تـەورات) دەبینـێ بـە دەسـتی (عومـەری کـوڕی خـەتتاب)ەوە (رضـى الله عنـه)، یەکسەر توڕە دەبی و سور هەڵدەگەڕێ و دەفەرموێت: (انـه والله لـو كـان موسـى حياً بين أظهركم ما حل له إلاّ أن يتبعني)[1].

واتە: (بێگومان سوێند بە خوا ئەگەر موسا پێغەمبەر(عليـه السلام) ئێستا زیندووبایە لەناوتاندا بۆی نەدەبو تەنها شوێن کەوتنی من نەبێت).

کەواتـە بۆمـان دەردەکـەوێ کـە پێغەمبـەر(صلى اللـه عليـە وسـلم) هـەر لـە سەرەتای دروستکردنی ئەو نەوەیەدا هەوڵی داوە، کە نەوەیەکی دڵ پاکی دەست پـاکی هەسـت پـاکی بیروبۆچـون پـاك پـەروەردە بکـات لەسـەر تاکـە پرۆگـرام (منهج)ی خوایی، تا دوور بن لە هەمو کارتێکەرێکی دەرەکی (خـارجی) خڵـت و خۆڵ تێکەڵ بـە بیروبۆچـون و خووڕەوشـتیان نـەبێت، بـەڵام پـاش ئـەوان وردە

---

١ـ رواه الحافظ ابو يعلي عن حماد عن الشعبى عن جابر.

ورده سەرچاوە ئەسڵی یەکە، کە قورئانە تەفسیرەکەی تێکەڵ کرا بە مەنتیق و فەلسەفەی ئیغریقییەکان و درۆ و دەلەسە و بیروبۆچونی فارسەکان و ئیسرائیلیاتی جولەکەکان، کە هەرگیز کۆمەڵێکی بە وێنەی کۆمەڵی هاوەڵان دروست نەبوە و نابێتەوە مەگەر کاتێ سەرچاوەی وەرگرتن بەو شێوەیەی سەرەوەی لێ بێت.

لێرەدا بۆمان دەردەکەوێ، کە تێکەڵ بونی سەرچاوەکان یەکەمین هۆکارە بۆ دروست نەبون و پەروەردە نەبونی کۆمەڵێکی قورئان ڕەفتار.

**٢ ـ شێوازی وەرگرتن:**

دوای هۆکاری یەکەم ئەم هۆکارە سەرەکییەش (اختلاف التلقي)مان هەیە لەگەڵ کۆمەڵی هاوەڵاندا، ئەویش ئەوەیە کاتێك، کە نەوەی یەکەم قورئانیان دەخوێند بە مەبەستی ڕۆشنبیری و شارەزایی و زانیاری وەرگرتن و گیرفان پڕ کردن و...نەبو، بەڵکو مەبەستیان بەجێ هێنانی فەرمانەکانی خوا و خۆ پەروەردە کردن بو لەبۆ ڕەزامەندی پەروەردگار، کە (ابن مسعود) دەڵێ: کاتێ کە قورئانیان وەردەگرت لە دە (١٠) ئایەت زیاتریان وەرنەدەگرت، کە ببێتە بار بەسەریانەوە، بەڵکو ئەو (١٠) ئایەتەیان لەبەر دەکرد و، هەڵسوکەوتی خۆیانیان لەسەر ڕادەهێنا، تا بە تەواوەتی قورئانەکە ڕەنگی دەدایەوە تیایاندا، بۆیە بەو شێوەیە دروست بون و توانیان ئەو تەکلیفەی، کە خوای گەورە بەسەریاندا جێبەجێی بکەن و نەوەیەکی قورئان ڕەفتاری بێ وێنەی ناوازە دروستبکەن، کە تا ئێستا مێژو بە خۆیەوە نەیبینیوە، جا دیارە هەر کەس و کۆمەڵێك بەو ڕوحەوە بەرەو قورئان نەچن و نەیکەنە بەرنامەی ژیان بۆ خۆیان و مەبەستیان جێبەجێکردنی فەرمانەکانی خوا نەبێت، ئەوا هەمیشە دوو دڵ و بەد گومان و بیروبۆچون لار و لێر دەبن و هەرگیز ناگەنە ئەنجامێك، کە پەروەردگار لە خۆیان ڕازی بکەن.

### ٣ ـ وازهێنان لە نەفامێتی و جاهیلییەت:

لە دوای ئەم دوو هۆکارە هۆکارێکی دیکەش هەیە ئەویش ئەوەیە: کاتێك نەوەی یەکەم موسڵمان دەبون و ئیسلامیان قبوڵ دەکرد، ئەوا بە هەمو شێوەیەك لە ژیانی نەفامییەوە کۆچیان دەکرد بۆ ژیانێکی ئیسلامی و هەرچی خووڕەوشت و عاداتی نەفامی هەبو بە تەواوەتی لە خۆیان دادەڕنی و لاپەڕەیەکی تازەیان لە ژیانی خۆیان هەڵدەدایەوە و قورئانیان دەکردە بەرنامەی ژیانیان و خۆیانیان ڕادەهێنا لەسەر ئەوەی، کە هیچ کارتێکەرێکی نەفامی کاریان تێ نەکات.

ـ (کەواتە بەم شێوەیە بۆمان دەردەکەوێ، کە هۆی دروست نەبونمان بە وێنەی نەوەی یەکەم سێ هۆکاری سەرەکییە، کە پێویستە لەسەرمان هەوڵی چاك کردن و ڕاستکردنەوەیان بدەین بۆ ئەوەی ببنە نەوەیەکی قورئان ڕەفتار و تەکلیفی سەرشانمان جێبەجێ بکەین بە بێ ئەوەی زۆر ناڕەحەتی توشمان ببێت، چونکە بە ڕاستی تەنها خوا خالقە و تەنها خۆشی شایستەی پەرستن و بەرنامەڕێژییە بۆ دروستکراوەکانی)[١].

## وانەی پێنجەم: پەروەردەی ئیمانیە

### أ ـ زیان و شوێنەوارەکانی گوناهکردن:

گوناهکردن چەندین زیان و ئاسەواری بەد و ناهەموار لەسەر دڵ و دیدە و دەروون و لاشەدا دروستدەکات، هەم لە دونیا و هەم لە دواڕۆژ دەبێتە مایەی شەرمەزاری و بێزاری گوناهکارەکە. ئەمانەی خوارەوەش هەندێکن لە ئاسەوارەکانی گوناهکردن:

١ ـ بێ بەش بون لە زانست و عیلم، چونکە عیلم نورێکە و خوا دەیخاتە ناو دڵی بەندەوە، بەڵام گوناه ئەم نورە دەکوژێنێتەوە.

---

١ ـ معالم في الطريق/ث.خ١٤/١٥ص٢٣.

هەر بۆیەش ئیمامی شافعی سکاڵای لە بیر چونەوە دەباتە لای مامۆستاکەی (وکیع) ئەویش پێی گوت واز لە گوناه و تاوان بێنە.

شـــكوت الى وكيـــع ســـوء حفظـــي
فارشـــدني الى تـــرك المعاصـــي
وأخبرنـــي بـــان العلـــم نـــور
ونـــور الله لا يهـــدى للعاصـــي

٢ ـ بێ بەش بون لە ڕزق و بژێوی، پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێت: (إن العبد ليحرم الرزق بالذنب يصيبه)[١].

واتە: بێگومان بەهۆی گوناه و تاوانەوە بەندە لە رزق بێ بەش دەبێت.

٣ ـ گوناهکار غوربەت و نامۆیی یەکی وای دەکەوێتە دڵ ئەگەر تەواوی خۆشییەکانی دونیای هەبێ ئەم غوربەت و نامۆیی یەی لانادات.

٤ ـ کاروبارەکانی بە زەحمەت دەکەوێ.

٥ ـ تاریکی یەکی وای دەکەوێتە دڵ وەك تاریکایی شەو هەستی پێ دەکات.

٦ ـ لە گوێ ڕایەڵی (الطاعة)ی بێ بەش دەکات.

٧ ـ گوناه گوناهی دیکە بە دوای خۆیدا دێنی و وا لە گوناهکارەکە دەکات. دەست بخاتە ناو گوناهی تر. تا لە ئەنجامدا سەرگەردانی دەکات و دەرگای لێ دادەخات.

٨ ـ وا لە دڵی بەندە دەکات. کە ڕوی بە لای گوناهاندا بێت و پشتی لە تەوبە و پەشیمانی بێ. تا لە ئەنجامدا بە تەوبە ڕاناگات و عەزیمەتی ناهێڵێ.

٩ ـ وا لە بەندە دەکات پێی ئاسایی بی و گوناهەکەی لە لا سوك و ئاسان دەبێ، بە جۆرێك ئەگەر بە ئاشکرایی و لەبەرچاوی خەڵکیش بێت. هەر پێی ئاساییە، کە ئەوەش نیشانەی بە هیلاك چونە.

---

١ ـ رواه احمد وقال البوصيري في الزوائد هذا اسناد حسن.

١٠ ـ زۆر گوناهکردن پەرەی ڕەشی ئەستور بەسەر دڵدا دێنی و بەندە دەباتە ریزی غافڵ و بێ ئاگاکانەوە.

١١ ـ گوناه وا لە بەندە دەکات خوای گەورە فەرامۆش بکات و، ئینجا خواش ئەو فەراموش دەکات ( وَلَا تَكُونُوا۟ كَٱلَّذِينَ نَسُوا۟ ٱللَّهَ فَأَنسَىٰهُمْ أَنفُسَهُمْ ۚ أُو۟لَـٰٓئِكَ هُمُ ٱلْفَـٰسِقُونَ )[١].

١٢ ـ گوناه نیعمەتەکانی خوا ڕەش دەکاتەوە و سزا و ناڕەحەتییان دێنێتە پێش (وَمَا أصَابَكُمْ مِنْ مُصِيبَةٍ فَبِمَا كَسَبَتْ أيْدِيكُمْ وَيَعْفُو عَنْ كَثِيرٍ)[٢].

١٣ ـ گوناه دەردی دڵانە و توشی تەنگ و چەڵەمە و مەینەتی و سینە تەسکی و بێ ئومێدی و ترس و خەفەتی دەکات[٣].

## ب ـ هۆیەکانی لاوازی و نزمی ئیمان:

دیارە زۆر هۆکار و ڕەفتار مایەی لاوازی و نزم بونەوەی ئیمانن، کە ئەمانەی خوارەوە هەندێکیانن:

### ١ ـ دوور کەوتنەوە لە تێکەڵاوێتی ئیمانداران:

لەبەرئەوەی ناتوانێ هێزێکی ئیمانی وەرگرێ، هاندەر و نوێ بونەوەی بۆ نابێ، ئاگای لە حاڵ و بارودۆخی موسڵمانان دەبڕی و نامێنێ، لە خەم و خۆشی و شادی و ناشادی بێ بەش دەبێ، کاریگەرییە ئیمانییەکانی لەسەر کەم دەبێتەوە، تا دڵی ڕەق و ئیمانی سارو سست و نزم دەبێت...وەکو خوای گەورە دەفەرموێت: (فَطَالَ عَلَيْهِمُ ٱلْأَمَدُ فَقَسَتْ قُلُوبُهُمْ )[٤]..

---

١ ـ الحشر/١٩.
٢ ـ الشورى/٣٠.
٣ ـ الجواب الكافي لمن سأل عن الدواء الشافي لابن القيم.
٤ ـ الحديد/١٦.

### ٢ ـ بیر نەکردنەوە لە ئاخیرەت و دوا ڕۆژ:

کە دەبێتە هۆی لە بیر چونەوەی پاداشتی ئیمانداره تەواوەکان و دەبێتە هۆی لە بیر چونەوەی ئازاری بێ باوەڕ و تاوانکاران...ئینجا وردە وردە لە چاکە دوورو لە خراپە نزیك دەبێتەوە، تا ئەو کاتەی خۆی لە ناو گوناه و تاوان و ئیمانێکی نزم و لاوازدا دەبینێتەوە.

### ٣ ـ خۆشەویستی دونیا:

بە جۆرێك وا تێ دەگات، کە هەردەم بۆی دەمێنێ، دونیای پێ باشتر بێ و خۆشتر بوێت، تا ئاخیرەت هەر هەوڵی پارە کۆکردنەوە و پەیدا کردن بێت، هەر چاوی ببڕێتە دەسکەوتی دونیایی بە جۆرێك دین و ئیمانی لە بیر بباتەوە...تا لەو کاتەشدا ئیمانێکی لاواز و بێ هێزی بۆ دەمێنێتەوە.

### ٤ ـ ژیان لە دەوروبەرێکی نەفامیدا:

ئەوانەی لە دەوروبەرێکی نەفامیدا دەژین هەڵبەت کاریان تێ دەکات و ڕۆژانە گۆڕانی دەبێت و هەفتانە هەڵپەڕکێ و سەما دەبینێ، هەندێك جاریش فەساد و فاحیشەی لێ نزیك دەبێتەوە بە شێوەیەك تیشکی ئیمانی بۆ نایێت، کە ئەمانەش بێگومان لە ئیمان دووری دەخەنەوە، ئەگەر خۆی زۆر نەپارێزێ لەوانەیە، وەکو نەفامەکانی لێ بێت.

### ٥ ـ نەبونی مامۆستا و عیلمی شەرعی:

کە عیلمی نەبێ چۆن ئیمانی بەرز دەبێتەوە، کە مامۆستای نەبێ چۆن هاندەرێکی بەرچاو ببینێ و هانی بدات لەسەر دینەکەی، کە عیلمی نەبێ چۆن پەند و قسە بە نرخەکان وەرگرێ، کە مامۆستای نەبێ چۆن ڕێگەی خۆپاراستن و ڕقەبەرایەتی جاهیلیەت و نەفامێتی بدۆزێتەوە.

# بەشی (٩)

# هۆشیاری و ڕوناکبیری

★. ئایا ئێمەی موسڵمان بۆمان هەیە هەوڵ بدەین ئەم فکر و کۆمەڵانەی (الأفكار والأحزاب)، کە لەم سەردەمەدا دروستبون بیان ناسین؟:

بەڵێ دەبێت ئێمە هەوڵ بدەین بناغە و بیروبۆچونیان بزانین بۆ ئەوەی لێیان دوور کەوینەوە و خۆمان بپارێزین لە مەبەستە گلاوەکانیان بەلگەشمان بۆ ئەم قسەیە حذیفەی کوڕی یەمانە، کە دەڵێ: خەڵکی پرسیاریان لە پێغەمبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) دەکرد دەربارەی خێر و چاکە، بەڵام من پرسیارم لێدەکرد لە شەڕ و خراپە بۆ ئەوەی نەوەکو تێبکەوم بۆیە گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) ئێمە زووتر لە ناو نەفامی و خراپەدا بوین، خوای گەورە ئەو خێر و چاکەیەی بۆ هێناین، ئایا دوای ئەم خێرە شەڕ و خراپەی کە هەیە؟ فەرموی ((بەڵێ هەیە))، گوتم: ئایا دوای ئەم شەڕە خێر و چاکە هەیە؟ ئەویش فەرموی: بەڵێ بەڵام لێڵی و ناڕێکی تێدایە (فيه دخن)، گوتم ئەو لێڵی و ناڕێکیە چییە؟ فەرموی: (گەلێکن شوێن غەیری سوننەتەکانی من دەکەون و بە غەیری ڕێباز و ڕێگاکەی من کار دەکەن و پێ هەڵدەگرن تۆ هەندێك شتیان بە چاك دەزانی و هەندێك شتیان بە خراپە، گوتم ئایا دوای ئەم خێرە شەڕ هەیە؟ فەرموی: (بەڵێ) بانگ کەرانێك لەسەر دەرگای دۆزەخن هەر کەسێك بڕوات بە دەنگیانەوە و وەڵامیان بداتەوە فڕێ دەدرێتە ناو ئاگرەوە.

گوتم ئەی پێغەمبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) باسیان بکە بۆمان ئەوانە کێن؟ فەرموی: (کەسانێکن لە پێستی خۆماندان وە هەر بە زمانی خۆشمان قسە دەکەن).

گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) چی بکەم ئەگەر توشی ئەو ڕۆژە هاتم؟ فەرموی: دەست بگرە بە کۆمەڵی موسڵمانانەوە وە بە پێشەواکانیانەوە و خۆت قایم بکە. گوتم: ئەگەر موسڵمانان لەو کاتە کۆمەڵ و پێشەوا (إمام)یان نەبو؟ فەرموی: دەی واز بێنە لە هەرچی کۆمەڵی دیکە هەیە بانگەوازی چو بی گازیشت گرتبێ لە قەدی دارێك، هەتاوەکو گیانت دەردەچێ.

ئەمەش دەقی فەرمودەکەیە: (قال حذيفة بن اليمان: كان الناس يسألون رسول الله(صلى الله عليه وسلم) عن الخير و كنت أسأله عن الشر مخافة ان يدركني، فقلت يا رسول الله إنا كنا في جاهلية و شر، فجاءنا الله بهذا الخير، فهل بعد هذا الخير من شرّ؟ قال: ((نعم)) قلت: هل بعد ذلك الشر من خير؟ قال: ((نعم)) وفيه دخن؟ قال؟ ((قوم يستثون بغير سنتي و يهتدون بغير هدي تعرف منهم و تنكر)) فقلت: هل بعد ذلك الخير من شر؟ قال: ((نعم)) دعاة على أبواب جهنم من أجابهم اليها قذفوه فيها..فقلت: يا رسول الله صفهم لنا: قال: قوم من جلدتنا و يتكلمون بألسنتنا)) قلت يا رسول الله فما ترى ان ادركني ذلك؟ قال ((تلزم جماعة المسلمين و إمامهم)) فقلت: فإن لم تكن لهم جماعة ولا إمام؟ قال فاعتزل تلك الفرق كلها، ولو أن تعض على أصل شجرة حتى يدركك الموت وأنت على ذلك)[1].

کەواتە ئێمەی موسڵمانیش سود لەم فەرمودەیە وەردەگرین و دەبێ بزانین کە (بانگەوازی شەڕ و خراپە) ئەوانەن کە لەسەر ڕێبازی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) دوورن و پەیڕەوی ناکەن لە ژیان و بەرنامە و حوکمڕانیاندا. بۆیە دەبێت ئێمەش ئاگاداری ئەو کۆڕ و کۆمەڵانە بین و بە چاکی بیانناسین و ئامانجەکانیان پووچەڵ بکەینەوە.

١ ـ أخرجه البخاري ـ فتح الباري ـ ج١٦ ص١٤٤.

## وانەی یەکەم: ئایا حوکم و یاسا بۆ گەلە یان بۆ خوای بالاّ دەستە؟

دوژمنانی خوا و سەر لێ تێکدەرانی مرۆڤایەتی هەمیشە هەوڵ دەدەن، کە کۆمەڵێك قسەی زەق و بێ ناوەرۆك خەڵکی چەواشە بکەن و لە ڕێگای ڕاست و بێ گەرد دووریان بخەنەوە و، بیان کەنە کۆیلەی بیرە پووچەڵەکانی خۆیان ئەمەش، کە (دەڵێن دەبێت حوکم و یاسا بۆ گەل و بە دەست گەل بێت) یەکێکە لەو ڕستە درۆیانەی، کە لە جیهاندا دەیانەوێ گەلانی پێ لە خشتە بەرن و بیان خەنە شوێن ئاواتە گلاّوەکانی خۆیان، بۆیە ئەگەر سەنج بدەینە ئەو جۆرە کەس و کۆمەڵانە، تەنها بۆ خاڵێکی خۆشیان دانابەزن و لە خۆیان نابورن بۆ رەئی و خواستەکانی گەل...بەڵکو ڕاستی و چاوڕۆشنی ئەوەیە، کە بڵێین حوکم و یاسا و بڕیار تەنها و تەنها هەر بۆ خوای گەورە و بالاّ دەستە و هەرچی ئەو نەیلێت و بڕیاری لەسەر نەدات دەبێ چاك بزانین، کە هەمو پووچەڵ و بێ کەڵکە، پێچەوانەی ئەم ڕاستیەش دەبێ چاك بزانین، کە هەموی بریتییە لە بیروزادەی ئەو حزب و کۆمەڵانەی، کە بێ باوەڕن و خوای گەورەش دەفەرموێت: (إِنِ ٱلۡحُكۡمُ إِلَّا لِلَّهِ)[1].

هەروا دەفەرموێت: ( وَمَن يَبۡتَغِ غَيۡرَ ٱلۡإِسۡلَٰمِ دِينٗا فَلَن يُقۡبَلَ مِنۡهُ وَهُوَ فِي ٱلۡأٓخِرَةِ مِنَ ٱلۡخَٰسِرِينَ )[2].

هەروا دەفەرموێت: ( أَفَحُكۡمَ ٱلۡجَٰهِلِيَّةِ يَبۡغُونَۚ وَمَنۡ أَحۡسَنُ مِنَ ٱللَّهِ حُكۡمٗا لِّقَوۡمٖ يُوقِنُونَ )[3].

ـ واتە: لە دەرچون و یاخی بون لە ڕژێم و دەستوری خوای گەورە، کە پڕە لە خێر و خۆشی و بەختەوەری بۆ ئادەمیزاد لە جیهاندا، یەکسان کردنی ئەو

١ ـ یوسف/٤٠.
٢ ـ آل عمران/٨٥.
٣ ـ المائدة/٥٠.

دەستورە خواییە بە ڕژێم و دەستورە دروستکراوەکانی جاهیلیەتی دەستی مرۆڤ لای خوای گەورە زۆر ناپەسند و ناڕەوایە و دوور کەوتنەوەیە لە ڕێگای ڕاست و نەفامی و گومڕاییە.

ئەو ڕژێم و دەستورە دروستکراوانە وەك ڕژێم و دەستورە داهێنراوەکانی جاهیلیەتی پێش ئیسلام، کە بریتی بون لە چەند شتێکی هەڵقولاّ و لە ویست و ئارەزووی مرۆڤ.

## ئایا دوژمنانی دین یەکدەنگ و هاوپشتیوانن بۆ دژایەتی کردنی ئیسلام و موسڵمانان؟

ئاشکرایە، کە دەوڵەتە بێ بڕوایەکان ئەگەر چی جیاوازیش بن لە بۆچون و تێڕوانینیان بۆ ئیسلام، ئەوە بێ گومان هەموویان هاودەنگ و پشتیوانن بۆ دژایەتی و دوژمنایەتی کردنی ئاینی ئیسلام، چونکە دەزانن بە بەرزی و گەیاندنی دەنگی ئیسلام بە گوێی گەلان و خەڵکانی تینوو بە حەق و ڕاستی و دادپەروەری ئەوان بەرەو لەناوچون و پووکانەوە دەچن.

ئینجا لە دوژمنایەتیشیاندا هەریەکە و شێوازێکیان بۆ خۆیان هەڵبژاردوە و دژایەتی بەرنامەی ڕاستی خوایی پێ دەکەن. بۆ نمونە: شوعیەت دوژمنایەتی خۆی بە ئاشکرا دەکات و بە ڕاشکاوی هەوڵی لەناوبردنی ئیسلام و موسڵمانان دەدات.

خاچ پەرستەکانیش (الصليبية) بە نهێنی و لە پشت بیر و کۆمەڵە ڕوخێنەرەکانەوە دژایەتی خۆیان دەکەن، لە چەندەها شوێن هەڵدەستن بە کردنی موسڵمانان بە خاچ پەرست بە تایبەتی ئەوانەی، کە کەم شارەزای ئیسلام بون و دوورن لە کۆمەڵی موسڵمانان.

هەروەها ئەوەش جولەکە و (یەهود)ەکانن، کە لە پشت هەمو کۆمەڵ و حزبێکی بێ دینەوە دەوەستن، سوریان دەکەن و هانیان دەدەن بۆ پەرەسەندنی

بێ ڕەوشتی و لەناو بردنی هەمو دابونەریتێکی پاك و ڕەوشت بەرزی وەك ماسۆنیەت و (الصهيونية العالمية) وە بابی و بەهائیەکان و....هتد.

## وانەی دووەم: پێناسەی هەندێك لە بیرۆکەکانی ئەم سەردەمە (١)

### ١ ـ التنصير: بەگاورکردن:

ڕێچکە و ڕێبازێکی ڕوخێنەر و داگیرکەرە، کە هەمیشە هەوڵ دەدات بۆ دژایەتی کردنی ئیسلام و دەست گرتن بەسەر خاك و ئاویدا. دوای شکاندنیان لە شەڕەکانی خاچ پەرستیەکاندا زیاتر دەرکەوتن و بلاو بونەوە بە جیهاندا بۆ ئەوەی فیتنە و ئاژاوە زیاتر دروستبکەن و ئەمەش زیاتر بۆ ئەوەی گەلانی موسڵمان لاواز و کەم هێز بکەن وە پروپاگەندەش دەکەن، کە عیسی(علیە السلام) کوڕی خوایە و ژەهری خۆیان لە هەمو ڕوەکانەوە دەڕێژن و گەلانی هەژاری پێ چەواشە دەکەن. بەرگریش لەم بیرە پووچەڵە، دەست گرتنە بە قورئان و فەرمودە شیرینەکانی پێغەمبەری ئازیز(صلى الله عليه وسلم) وە پەیوەست بونە بە کۆمەڵی موسڵمانانەوە وە ئاگاداری لە زانستەکانی ئیسلام و زانستی ئەوەی، کە ئاینی (النصارى) ئێستا دەست کاری کراوە و لە جێی خۆی نەماوە، کە لە بنچینەدا لەسەر شێوەیەکی پاك و ڕاست هاتوە بۆ عیسی پێغەمبەر(علیە السلام) بۆ تەواوکەری بەرنامەی موسی پێغەمبەر(علیە السلام).

### ٢ ـ الشيوعية: شوعیەت:

بریتیە لە ڕێبازێکی فکری، کە لەسەر (إلحاد) و بێ باوەڕی دامەزراوە ماددە لە لای شوعیەت بنچینەی هەمو شتێکە و، یەکەم جار لە ئەڵمانیا لەسەر دەستی مارکس و (انجلز) دەرکەوت لە پاشاندا لە ڕوسیا بە نەخشەی جولەکە

دەرکەوتن، بەرە بەرە لەسەر حسابی خەڵکانی تر بە ئاگر و ئاسن فراوان بوو، کە موسڵمانانی دەروون پاك زیانی زۆریان چێشت بە دەستیەوە. ئەو بناغەیەش، کە لەسەری دروست بوە زۆرن. بۆ نمونە:

١ - ئینکاری کردنی بونی خوا و ئاین و پێغەمبەران و شعاریان بریتیە لە (لا إله والحياة مادة).

٢ - نەهێشتنی شیرازەی ڕەوشت و چاکەخوازی.

٣ - دروستکردنی ڕق و کینە لە نێوان هەژار و دەوڵەمەندا.

هەروەها لە زۆر شوێندا ئافرەت دەکەنە داردەستێکی خۆیان بۆ خەڵەتاندنی خەڵکی و لە خشتە بردنیان و ڕاکێشانیان بۆ لای مەبەستە گڵاوەکانی خۆیان.

### ٣ - الصهيونية : سەهیۆنیەت:

بزووتنەوەیەکی سیاسی ڕەگەز پەرستی (عنصرية) توندڕەوە. بە ئاواتی دروستکردنی دەوڵەتێکی جولەکەیە لە فەلەستین دا، کە لە ڕێگای ئەم دەوڵەتەوە فەرمان ڕەوایی جیهان بکات.

بناغەی (صهيونية) دەگەڕێتەوە بۆ جولەکەی نەمساوی (هرتزل)، کە یەکەم کەسە هەستاوە بە بانگەواز کردن بۆ (صهيونية) وە ئەم فکرمیە بریتیە لە ڕەنگ دانەوەی جولەکانی سەر زەوی.

ئامانج و ئاواتەکانیان بۆ بەدەست هێنانی حوکم و دەسەڵات پەیدا کردن و زۆر پیس و خراپن. بۆ نمونە: زەبر و زۆر و ترساندن بە چاکترین هۆکار دەزانن. وەدەست کەوتنی سەروەت و سامانی زۆر بە هەر ڕێگایەك بێت، بەکارهێنانی ڕەشوە خواردن و خیانەت بازی و فرت و فێڵ و درۆ. بۆ چەواشە کردنی خەڵکی شعاری (ئازادی و یەکسانی و برایەتی) بەرز دەکەنەوە.

## وانەی سێهەم: پێناسەی هەندێك لە بیرۆكەكانی ئەم سەردەمە (٢)

### ٤ـ الماسونیە:

ڕێكخراوێكی جولەكەی نهێنی و تۆقێنەرە و ڕێكخستنێكی شاراوەی پتەوە، ئامانجی زامنكردنی دەسەڵاتی جولەكەیە بەسەر جیهاندا، بانگەواز دەكات بۆ بێباوەڕی و بێڕەوشتی و حەڵاڵ كردنی هەمو حەڕامێك، ئەندامانی خۆی لە كەسانی ناودار و سیاسەتمەدار دروستدەكرد. پەیمانی پاراستنی نهێنییەكانی لێ وەردەگرتن.

دامەزرێنەری ئەم ڕێكخراوەیە مەلیكی ڕۆمان (هیرۆدس اكریبا) بو بە یارمەتی دوو ڕاوێژكار (مستشار)ی جولەكەی خۆی، بێبڕوا بون بە خوا و پێغەمبەران و بە هەمو شتێكی غەیبی، هەمیشە هەوڵی پارچە پارچە كردنی وڵاتانیان دەدا و كێشە و شەڕ و ئاژاوەیان دەخستە ناو شار و وڵاتەكانەوە.

### ٥ـ العلمانیة: علمانیەت:

ڕێباز و بانگەوازێكە بۆ بنیاتنانی ژیان لەسەر بناغەی دوور لە ئاینی، واتە بە مانا سیاسییەكەی بێ دینی (اللادینیە) لە فەرمان ڕەواییدا، ئەم بیرۆكەیەش لە ئەوروپا سەری هەڵدا دژی كەنیسە و بەرە بەرە هەمو وڵاتانی گرتەوە، زیاتر بەهۆی شیوعیەت و ئیستعمار و مزدە دەرەكانەوە، بەم شێوەیە بیروڕاكانی خۆیان لە جیهانی ئیسلامیدا بۆ هەڵخەڵەتاندنی خەڵكی بڵاوكردەوە ئەویش بە تانە دان لە ئیسلام و قورئان و پێغەمبەران و پیشاندانی خەڵكی بەوەی، كە ئیسلام تەنها كۆمەڵێك (دوعا و نزا و شعاری ڕۆحی و گیانین و هیچی دیكە) یان ئیسلام دەبێتە هۆی دواكەوتن و لەگەڵ ئەم ئاست و سەردەمەدا ناگونجێ.

یەكێكی تر لە ژەهرە گڵاوەكانیان ئەوەیە، كە دەڵێن: ئێمە دژی ئیسلام نین

و بە ڕواڵەت خۆیان بۆ خەڵیك بە بڕوادار و خواپەرست دەدەنە قەڵەم تاوەكو دەستەڵات پەیدا بكەن و حوكمڕانیان بكەوێتە دەست ئەو كاتە هەر چیان بوێت دەیكەن و بێ گوێدانە هیچ ماف و دادوەرییەك.

**٦ـ الوجودیة: وجودیەت:**

تەیار و بۆچونێكی فەلسەفییە مرۆڤ لە سەروی هەمو شتێكەوە دادەنێت و بڕوای وایە، كە مرۆڤ تاكە كەسێكە خۆی بۆ خۆی خاوەنی بیر و ئازادی و هەست و ئارەزوی خۆیەتی و پێویستی بە كەسی دی نییە، كە ڕێ نیشان دەری بێت و نهێنییەكانی بۆ ڕونبكاتەوە، بەڵكو مرۆڤ خۆی سەرپشك و لێ زانە لە هەمو شتێكدا، هەر لەبەرئەوەش ئەو كۆمەڵە بۆچونێكی ڕون و ئاشكرایان نییە و تا ئێستاش نەیانتوانیوە جێگای خۆیان بكەنەوە لە ناو هیچ بیروباوەڕێكدا، بە ناوبانگترین كەسی ئەم سەردەمەیان فەیلەسوفی فەڕەنسییە كە ناوی (جان بول سارتر)ە، كە بێ باوەڕ و مولحیدە و پشتیوانی جولەكەیە.

بە هیچ شێوەیەك بڕوایان بە خوا و بەرنامەكەی نییە، بڕوایان بە هیچ ئاین و دین داریەك نییە. دەڵێن دەبێت مرۆڤ بە هەمو شێوەیەك سەربەست بێت، ئەم بیروبۆچونەیان لە ولاتە ئەوروپی و ڕۆژئاواییەكاندا بوەتە هۆی تێكدانی ڕەوشت و بلاوبونەوەی هەمو جۆرە فەساد و بەرەڵلاییەك و گوێ نەدان بە هیچ داب و نەریتێكی كۆمەلایەتی و مرۆڤایەتی.

**٧ـ التغریب:**

بریتییە لە تەیار و بۆچونێكی فراوانی زۆر لایەنەی سیاسی و كۆمەلایەتی و ڕۆشنبیری و هونەری. هەوڵ دەدات، كە ژیانی گەلان بە گشتی و موسڵمانان بە تایبەتی كێش بكات بەرەو شێوازێكی ڕۆژئاوایی (الغربي) بە مەبەستی سڕینەوە و نەهێشتنی كەسایەتییە سەربەخۆ و تایبەتمەندییەكەی و كردنیان بە چاكترین شوێن كەوتەی شارستانیەتی ڕۆژئاوا، ئەم هەوڵدانەش لە هەمان كاتدا هێرشێكی (نصرانیة ـ صهیونیة ـ إستعماریة)، كە مەبەستێكی هاوبەش

کۆی کردبونەوە ئەویش گۆڕینی جیهانی ئیسلامی بو بە قالبێکی ڕۆژئاوایی و بۆ لابردن و کوژاندنەوەی ئەو کەسایەتییە ئیسلامییە بەرز و ڕەسەنەی، کە لەناو گەلانی موسڵماندا بو.

بۆیە توانیان بە خێرا بگەنە وڵاتانی ئیسلام و لایەنگران بۆ خۆیان پەیدا بکەن و بانگەشە بکەن بۆ بیرە ڕوخێنەرەکەیان بە هەندێ پروپاگەندەی زاق و بریق، کە بو بەهۆی هەڵخەڵەتاندنی کەسانێکی زۆری زۆربەی توێژەکانی ناو کۆمەڵگەی ئیسلامی، تا وای لێهات هەندێك لە زاناکانی ئیسلامیش بە کۆمەڵێ بۆچونی ڕۆژئاوایی خەڵەتان و لە نوسینەکانیاندا ڕەنگی دەدایەوە.

بۆ نمونە: لە هەندێك بۆچونی مامۆستا (محمد عبده) ـ (محمد حسین هیکل) ـ (جمال الدین افغانی) لە سەرەتای کاریەوە...هتد چەند کەسانێکی تر تاکو ئێستاش کەسانی ساویلکە و سادە هەر خەون بە ڕۆژئاوا دەبینن و هەوڵ دەدەن شوێن پێی ئەوان هەڵبگرن لە هەمو ژیانیاندا.

بەڵێ ئێمەی خاوەن باوەڕ و شوێنکەوتەی قورئان و سوننەت دەبێ چاك بزانین ئەمانە هەموی چەواشە کردنە، خوا و پێغەمبەرەکەشی زۆر بە ڕونی ئاگادارمان دەکەنەوە، کە بە هیچ شێوەیەك شوێن بێ باوەڕان نەکەوین و خۆشمان نەوێن و دڵیان پێ نەدەین.

هەروەك دەفەرموێت: ﴿ وَلَا تَرْكَنُوٓاْ إِلَى ٱلَّذِينَ ظَلَمُواْ فَتَمَسَّكُمُ ٱلنَّارُ ﴾[1].

---

١ ـ هود/١١٣.

# بەشی (١٠)

# بەسەرهات و ژیانی پێغەمبەرﷺ

## وانەی یەکەم: پێش کۆچ و کۆچکردن

### دەرچونی پێغەمبەرﷺ بۆ (طائف):

بە مردنـی (ابـو طالـب) و (خدیجة) پێغەمبـەرﷺ دوو لایـەنگر و پاڵپشتی گەورەی لە دەست چو.

لــە دوای مردنـــی ئــەوان کافرەکـانی قــوڕەیش ئــازاردان و بــەرگریان بــۆ پێغەمبەرﷺ زیادی کرد.

لەبەرئــەوە پێغەمبــەرﷺ بــەرەو (طـائف) بــە هاوڕێیــەتی (زیـد)ی کـوڕی (حارثة) ڕۆیشت، بە ئومێدی ئەوەی کەسانێك لە نێو طائف دا بدۆزێتــەوە، کە پاڵپشتی بکەن و لە ڕاگەیاندنی پەیامی خوای گەورەدا یارمەتی بدەن، بەڵام بە داخــەوە خــەڵکی طـائف پێشـوازیان لێنــەکرد وبــە دەنگیــەوە نەچـون، نــەك هەرئەوەش، بەڵکو توندترین شێواز ئازاریـان دان و گێـل و نەفامـەکانیان هانـدا دوایان بکـەن و بـەردبارانیان بکـەن، تـا وای لێهات خـوێن لـە پێـی پێغەمبـەری ئــازیزەوە ﷺ دەرچــوو، ســەری (زیـد)یــش - کـە هــەوڵی دەدا بــەرگری لــە پێغەمبەرﷺ بکات - بریندار کرا..

لەبەرئــەوە پــەنایان بــردە بــەر باخێـك و لــەوێ تۆزێـك حەسـانەوە، پاشـان هەستان ملی ڕێی مەککەیان گرتە بەر.

پێغەمبــەرﷺ داوای لــە خــوای گــەورە کــرد، تــا لــە هــەمو تەنگانـــە و ناڕەحەتییەکەدا دەرگایەکی بە ڕەحمەت و ڕزگاری لەسەر بکاتەوە.

پێغەمبەرﷺ کە لە مەککە نزیك بویەوە نـاردی بـە دوای (مطعـم)ی کوڕی (عـدي) داوای لێکـرد، کـە لـە پـەنای ئـەودا خـۆی بکـات بـە مەککـەدا. (مطعـم)

ئەوەی زۆر پێخۆش بو، لەبەر ئەوە خزمانی خۆی کۆکردەوە بە چەکەوە ڕویان کردە (مسجد الحرام) پاشان داوای لە پێغەمبەرﷺ کرد کە بێتە شارەوە، ئەویش هات و ڕوی کردە (کعبة) و بە دەوریدا سوڕایەوە، پاشان چوە ماڵی خۆی و سوپاس بۆ خوا هیچ خراپەیەکی نەهاتەڕێ.

## شەوڕەوی و بڵندبونەوەی (الإسراء والمعراج):

لە دوای گەڕانەوەی پێغەمبەرﷺ لە (طائف)ەوە بۆ مەککە، دەستی کرد بە ناساندنی خۆی وەك پێغەمبەرێك بەو خێڵانەی، کە بۆ حەج سەردانی کەعبەیان دەکرد و، هەوڵی دەدا پەیامی خوای گەورەیان پێ بناسێنێت، هەروەها بانگێشەی موسڵمان بونی بۆ دەکردن، بەڵام خێڵەکان بانگێشەکەیان ڕەت دەکردەوە و، هەندێکیشیان زۆر بە ناشیرینی وەڵامیان دەدایەوە و، بە ڕویدا هەڵدەشاخان.

لە بەرامبە ئەوەد خوای گەورە و باڵادەست ڕێز و میهرەبانی خۆی لەسەر دەنێ و شەوێك لە (مسجد الحرام)ەوە بۆ (مسجد الاقصى) شەوڕەوی پێدەکات، لەوێشەوە بەرەو ئاسمان بڵندی دەکات تا بەشێك لە نیشانە و بەڵگە مەزنەکانی خوای گەورە ببینێت.

ئەوە بو لەو بڵندبونەوەیدا بەرەو ئاسمان، پێنج فەرزەی نوێژ لەسەر خۆیی و باوەڕدارانددا فەرز کرا، نوێژ بو بە نوری چاوی پێغەمبەری ئازیزمان.

بەیانی، هەواڵی شەوڕەوی و بڵندبونەوەکەی و ئەوانەی دیتبوی بە قوڕەیشیەکانی ڕاگەیاند، بەڵام ئەوان باوەڕیان پێنەکرد، بەڵکو هەر گوێشیان پێنەدا، هەمو ئەو بەڵگە ڕون و ئاشکرایانەی بۆی باس کردن ئەوەندەی کە دوورکەوتنەوە و دەستیان دایە سەرپێچی کردن.

بەڵام (ابوبکر) ﷺ هەرکات پێغەمبەرﷺ هەواڵێکی دەربارەی شەوڕەوی و بڵندبونەوەکەی لا باسکرد دەیگوت: (ڕاست دەفەرمویت ئەی پێغەمبەری خوا) بەمە ناوی (الصدیق)ی دووبارە پێ بەخشرایەوە.

## دوو پەیمانی (عەقەبە):

جولەکەکانی (یثرب) شانازییان بە ئاینەکەی خۆیانەوە دەکرد، لافیان بەسەر عەرەبە بت پەرستەکانی خێڵی (اوس) و (خزرج)ی ناو (یثرب)ەوە لێدەدا و دەیانگوت پێغەمبەرێك دەردەکەوێت و ئێمە بەهۆی ئەوەوە سەردەکەوین بەسەر عەرەبەکاندا، جولەکەکان حەزیان دەکرد شەڕ لەگەڵ عەرەبەکاندا هەڵگیرسێنن، لەبەرئەوە هەندێك لە عەرەبەکان شارەزای ئاینە ئاسمانیەکان بوبون و هەندێکیشیان خوازیاری ئەوە بون لەو بە خۆدا هەڵدان و خۆبادان و لەو شەڕە نەخوازراوانەی جولەکەکان ڕزگاریان ببێ.

پێغەمبەرﷺ پەیوەندی بە عەرەبی (یثرب)ەوە هەبو، ئەوە بو خاڵوانی و خزمانی (عبدالمطلب)ی باپیری لەوان بون، گۆڕی باوکیشی هەر لای ئەوان بو، لە تەمەنی شەشساڵیدا سەردانی گۆڕەکەی کردبو لەگەڵ دایکیدا.

پێغەمبەرﷺ لە یازدەهەمین ساڵی پێغەمبەرایەتیدا، بانگی خێڵە دابەزیوەکانی - بە مەبەستی حەج کردن - بۆ ناو مەککە دەکرد، جا لەو ماوەیەدا ڕێی کەوتە شەش پیاو لەو پیاوانەی (خزرج) و پەیامی ئیسلامی پێ گەیاندن، ئەم کەسانەی بەهۆی وتە و باسەکانی پێغەمبەرەوە دڵنیا بون، کە (محمد) ئەو پێغەمبەرەیە، کە جولەکەکان باس لە نزیکی هاتنی دەکەن، لەبەرئەوە بڕیاریان دا باوەڕی پێ بهێنن، خوای گەورە و پەروەردگاریش زیاتر دڵیانی بۆ ئیسلام کردەوە و سەرەنجام موسڵمان بون، کاتێکیش گەڕانەوە بۆ (یثرب) دەستیان کرد بە بانگێشەکردنی خەڵکانی خێڵەکەیان بۆ ئیسلام.

بۆ ساڵی دوایی و هەر لە کاتی حەج دا، دوانزە پیاویان دێن بۆ مەککە، لای (عقبە) چاویان بە پێغەمبەرﷺ دەکەوێت، لە چاوپێکەوتنێکدا ئەو پیاوانە پەیمان دەدەنە پێغەمبەرﷺ، کە هاوەڵ بۆ خوای گەورە نەسازێنن و فەرمان بەوانە بکەن، کە خوای گەورە فەرمانی پێدراوە و بەرگریش لە ناهەمواری و نادروستی بکرێت، ئەمە بە یەکەم پەیمانی (عقبة) دادەنرێت.

پێغەمبەرﷺ (مصعب)ی کوڕی (عمیر) لەگەڵ هاوپەیمانەکانیدا دەنێرێت بۆ (یثرب)، تا قورئانیان بۆ بخوێنێت و ئیسلامیان فێربکات و لە ئاینەکە شارەزایان بکات و تێیان بگەیەنێت، ڕۆیشتنی (مصعب) بۆ یثرب هۆیەك بو بۆ زیاد بونی ژمارەی موسڵمانان، یەکێك لەو کەسانەی لەسەر دەستی (مصعب) موسڵمان بو (سعدی)ی کوڕی (معاذ) بو، کە لە سەرۆکە مەزنەکانی (اوس) بو، ئیسلام بونی ئەویش بویە مایەی موسڵمان بونی ژمارەیەکی زۆر لە خێڵەکەی، لە وەرزی ساڵی یانزەهەمی پێغەمبەرایەتیدا بو، کە (٧٣) کەس لە موسڵمانانی (یثرب) بە پیاوو ژنەوە هاتن بۆ مەککە و پەیوەندییان بە پێغەمبەری خواوە کرد، پێغەمبەریش ﷺ داوایان لێ دەکات، کە لای (عقبة) چاوی پێیان بکەوێت، کە لەگەڵیان کۆ دەبێتەوە ـ لەم کۆبونەوەدا (عباس)ی مامیشی ـ تا ئەوکاتە هەر موسڵمان نەبو ـ لەگەڵ دەبێ، لەسەر ئەوە ڕێك دەکەون، لە هەمو شتێك بیپارێزن، کە منداڵ و ژنی خۆیانی لێ دەپارێزن، لە بەرامبەر ئەوەدا پێغەمبەریش لە گەڵیان هاوپەیمان دەبی و شەڕ لەگەڵ ئەوەدا بکات کە شەڕیان لەگەڵ دەکات و لەگەڵ ئەوەشدا ئاشت و تەبا بێت، کە ئەوان تەبان لە گەڵیدا.

پاشان پێغەمبەرﷺ داوایان لێ دەکات، کە (١٢) پیاو لە خۆیان هەڵبژێرن تا پەیمان بدەن بە بەجێهێنانی ئەو شتانەی، کە لەسەری ڕێك کەوتبون، ئەوانیش (٩) پیاویان لە (خزرج) و (٣) پیاویان لە (اوس) هەڵبژارد و پەیمانەکەیان بەست بەمە پەیمانی دووەمی (عقبة) بەسترا، کە سەرەتایەك بو بۆ کۆچکردنەکەی پێغەمبەرﷺ.

## کۆچکردن بۆ یثرب:

ئەوانەی پەیمانی دووەمی (عقبة)یان بەست، گەڕانەوە بۆ (یثرب) کە کافرانی قورەیش بەو پەیمانەیان زانی لە ئاکامەکانی ترسان، لەبەرئەوە ستەم و ئازاردانیان بەرامبەر موسڵمانان زیادی کرد.

پێغەمبـەرﷺ ڕێیـدا بـە موسـڵمانان تـا بـەرەو (یثـرب) کـە پشـتگیرکەر و یارمـەتی دەریـانی تێدایـە، کۆچبکەن، موسـڵمانان دەسـتیانکرد بـە کۆچـکردن بەرەو (یثرب) بە شێوەی تاك و کۆمەڵ، زۆربەشیان توشی زۆر بـەڵا هـاتن وەك ئەوەی نەهێڵرێ خزم و کەس و کاریان لەگەڵ خۆیان بەرن، یان نـەهێڵرێ پـارە و ماڵیان لەگەڵ خۆیان بـەرن، پـاش ماوەیـەك وای لێهـات، جگـە لـە پێغەمبـەرو (ابوبکر) و (علی کوڕی ابو طالب) و کەسانی بێ دەسەڵات و دەستەوسان، کە لـە لایەن کافرانەوە بـە دیـل گیرابـون کـەس لـە موسـڵمانان لـە مەککەدا نەمایـەوە، کاتێ کافران بە کۆچی موسڵمانانیان زانی هێندەی دی ترسەکەیان زیـادی کـرد، لەبەرئەوەی دەیانزانی، کـە خـەڵکی ئـەو شـارە جەربـەزە و نەبـەردن، هـەروەها کـافران دڵنیـا بـون لـەوەی، کـە گەیشـتنی پێغەمبـەرﷺ بـە موسـڵمانانی ئـەوێ، کاریگەرییەکی گەورە و مەزنی دەبـێ، لەبەرئـەوە لـە (دار النـدوة) کـۆ دەبنـەوە بڕیاری کوشتنی پێغەمبەرﷺ دەدەن.

بۆ ئەو مەبەستە گڵاوەش وا ڕێك دەکەون، کە لەهـەر خێڵێـك لـە خێڵەکانی قوڕەیش، لاوێکی بەهێز هەڵبژێرن و شمشێرێکی چاکی پـێ بێـت، ئینجا هـەمو ئەو لاو چاکانـە بـە یـەك جـارو بـە یـەك لێـدان پێکـەوە شمشێر لەسـەر سـنگی پێغەمبەرﷺ بچەقێنن.

چونکە کافران وایان دەزانی بەم شێوەیە خوێنی پێغەمبەری خـوا ونـدەبێت و لە نێو گشت خێڵەکاندا بڵاو دەبێتـەوە، ئـەو کاتـە خـزم و کەسـانی لـە خێڵی (عبدالمناف) نازانن چی بکەن و خوێنی بە یەکجاری وندەبێت.

خوای گەورە کردگاری باڵادەست پێغەمبەری ئازیزمانﷺ ئاگـادار دەکاتـەوە لەو بۆسەیەی کافران بۆی دادەنێن، لەبـەر ئـەوە پێغەمبـەرﷺ دەچێت بـۆ لای (ابـوبکر) و پێـی ڕادەگەیـەنێت، کـە خـوای پـەروەردگار ڕێگـەی پـێ داوە تـا کۆچبکات، ابوبکریش داوای لێ دەکات لەو کۆچەدا هاوەڵی بکات.

پێغەمبـەریش پێـی خـۆش دەبێـت و ڕەزامەنـدی دەردەبڕێـت. ابـوبکر لـە ئەنجامی ئەو هاوەڵییەی پێغەمبەری خوا ﷺ، فرمێسك لە هـەردوو چاوانیەوە

دەردەچـێت و دەچـێت دوو ئەسـپ و دوو كۆچـبار بـۆ سـەفەرەكەیان ئامـادە دەكات.

هـەروەها (ڕابـەرێك) بـە كـرێ دەگرێـت تـا ڕێگەكـەیان نیشـان بـدات، پێغەمبەرﷺ فەرمان بە (علی كوڕی ابو طالب) دەدات لـەو شـەوەدا، كـە پـیلان گێڕان بە نیـازن تیایـدا بیكـوژن، لـە جێگەكـەی ئـەودا، بنـوێ، كاتـێ كـافران لـە دەرەوەی ماڵەكەیدا كۆ دەبنەوە بە مەبەستی كوشتنی، ئەو لە مـاڵ دەردەچێت، خوای گەورەش چاویان لە ئاستیدا كوێر دەكـات، پێغەمبـەری خۆشەویستﷺ كاتێ بە لایاندا تێ دەپەڕێت مشتێ خـۆڵی دەشـتی (بطحـا)ی پـێ دەبـێ، بـە دەم خوێندنی ئەم ئایەتەوە:

(وَجَعَلْنَا مِنْ بَيْنِ أَيْدِيهِمْ سَدًا وَمِنْ خَلْفِهِمْ سَدًا فَأَغْشَيْنَاهُمْ فَهُمْ لاَ يُبْصِرُونَ) خۆڵەكە دەكات بە سەریاندا.

ئینجـا پێغەمبــەرﷺدەچـێتە دەرەوە و ڕو دەكاتــە مــاڵی ابـوبكر و پێكـەوە دەردەچـن، لـەو كاتــەدا كابرایـەك بـە لای پیلانگێڕەكانــدا - كـە لـە بـەردەم ژوورەكەی پێغەمبەردا خۆیان مەلاس دابو- دەڕوات و دەڵێت:

(ئەوە لەم بەر دەرگایەدا چاوەڕێی چی دەكەن)؟

ئەوانیش دەڵێن: چاوەڕێی - محمد - دەكەین.

كابرا پێیان دەڵێ:

- بەدبەختی هیچ لـە بـارا نەبوانـە - محمدـ بـە لاتانـدا تێپـەڕی و خۆڵیشـی كرد بە سەرتاندا.

گوتیان:

- كوا؟ بەخوا هیچمان نەماندیتوە!

پیلان گێڕان هەڵدەستن و خۆیـان دەتـەكێنن، ئینجا لـە كونێكی دەرگاكـەوە تەماشای ژوورەكە دەكەن و دەبینن یەكێك لە جێگاكەیدا نوسـتوە، ئـەوانیش وا دەزانن ئەو كەسە پێغەمبەرەﷺ بەڵام دوایی كـە دەبیـنن (علـی) لـە جێگاكـەدا

ڕاست دەبێتەوە شەرم دەیانگرێت و تەریق دەبنەوە. پێغەمبەرﷺ و ابوبكری هاوڕێی لە شار دەچنە دەرەوە و بە نهێنی بەرەو ئەشكەوتی (ثور) ڕێ دەگرنە بەر، لەو سەفەرەدا ابوبكر هەتا بڵێی بە بەزەیی و دڵسۆز دەبێت بەرامبەر پێغەمبەرﷺو هەمو شێوەیەك هەوڵی پاراستن و بەرگری لێكردنی دەدات، جارێك پێشی لێ دەگرێت و جارێك دوای لێ دەگرێت و جارێك لە دەستی ڕاستیەوە دەڕوات و جارێك لە دەستی چەپی، پاشانیش، كە دەگەنە ئەشكەوتەكە پێش پێغەمبەرﷺ دەكەوێت لە چونە ژورەوەدا، بۆ ئەوەی دڵنیا بێت لەوەی ئەشكەوتەكە هیچ شتێكی ترسناك و زیانبەخشی تێدا نییە، بۆ ماوەی (٣) ڕۆژ لە ئەشكەوتەكەدا دەمێننەوە هەمو ڕۆژێكیش (عبدالله)ی كوڕی (أبوبكر) دەچێتە لایان و هەواڵیان پێ ڕادەگەیەنێت، (أسماء)ي خوشكیشی خۆراكیان بۆ دەبات.

كافرانی قوڕەیش كە بە دەرچونی پێغەمبەرﷺ و (ابوبكر) دەزانن، بە گەرمی دەگەڕێن بە دوایاندا و، لە گەڕانەكەیاندا دەگەنە دەمی ئەشكەوتی (ثور).

ابوبكر بە پێغەمبەرﷺ دەڵێت: (پێغەمبەری خوا، ئەگەر هەر یەكێكیان تەماشای زەوی بەر پێی خۆی بكات دەزانێت ئێمە وا لێرەین). پێغەمبەرﷺ دەفەرموێت: (گومانی چی دەبەی بە حاڵی دوو كەس كە سێیەمیان خوای گەورە بێت؟ ترست نەبێ ئێمە خوای گەورەمان لەگەڵدایە. بەم شێوەیە كافران جێ پێی پێغەمبەرﷺ (ابوبكر) نابینن و بە شكست هاتویی دەگەڕێنەوە بۆ مەككە، لە دوای تێپەڕبونی (٣) ڕۆژ بەسەر مانەوەیاندا لە ئەشكەوتی (ثور)، ئەو ڕابەرەی، كە پێشتر لەگەڵیاندا ڕێككەوتبو بە پێی گفتەكەیان لە لایان ئامادە دەبێت و دوو ئەسپیشیان لەگەڵ خۆیدا بۆ دێنێت، پاشان هەمو پێكەوە بەرەو (یثرب) دەكەونە ڕێ، لەو كاتەدا هاوەڵگەران بە خەڵكی ڕادەگەیەنن (سەد حوشتر) بە خەڵات دەبەخشن بەهەر كەسێك، كە پێغەمبەریان بۆ دەستگیربكات.

بەمە ناپاکان و چاوچنۆکان هەوڵی دۆزینەوە و دەستگیر کردنی پێغەمبەرو ابوبکر دەدەن، یەکێك لەوانە (سراقە)ی کوڕی (مالیك) دەبێت، کە بە خۆی و ئەسپەکەیەوە جێ پێیان هەڵدەگرێت و لێیان نزیك دەبێتەوە، لە بەرامبەر ئەوەدا پێغەمبەرﷺ نزای لێدەکات و خوای گەورەش بە دەنگ نزاکەیەوە دێت و هەردوو دەستی وڵاخەکەی (سراقة) لە زەوی دەچەقێنێت، هەرچەند دەکات بۆی رزگار ناکرێ...

بەمە (سراقە) بۆی دەردەکەوێت ئەوەی ڕویداوە، لە ئاکامی نزاکەی پێغەمبەری ئازیزەوەیەﷺلەبەر ئەوە داوا لە پێغەمبەرﷺ دەکات، کە داوا لە خوای گەورە بکات لەو گرفتە رزگاری بکات، ئەویش لە بەرامبەر ئەوەدا گفتی دەداتێ، کە بە خەڵکی ڕابگەیەنێت پێغەمبەری نەدیوە ئەوان بەو ڕێیەدا هەر نەڕۆیشتون.

ئەو جار نزاکەی بۆ دەکات و دەستی وڵاخەکەی ڕزگاری دەبێت و پێغەمبەرﷺ بانگی دەکات و مژدەی بازنەکانی کیسرای پاشای ساسانیەکانی دەداتێ! (سراقە) ڕودەکاتەوە مەککە بە هاوەڵگەران ڕادەگەیەنێت، کە ئەو ڕێگایەی پشکنیوە و کەسی نەدیتوە، بەم شێوەیە حاڵی (سراقە) لە کەسێکەوە، کە بە تەماعی ماڵ و سامان شوێن پێی پێغەمبەرﷺ هەڵدەگرێ و بە نیازە لە دوای دۆزینەوەی بیدات بە دەست هاوەڵگەران، دەگۆڕێت بۆ کەسێك، کە هاوەڵگەران چەواشە بکات و گفتەکەی (کە بە پێغەمبەری دابو) بەجێ بهێنێ، هەر بەم شێوەیە ماوەی پێغەمبەرایەتی ناو مەککە کۆتایی هات.

## گەیشتنە (یثرب):

پێغەمبەرﷺ و ابوبکر و ئەوانەی کە لە گەڵیاندا بو بە ڕێگای نزیك کەناری دەریای سوردا ڕێی(یثرب)یان گرتە بەر، موسڵمانانی (یثرب) لەو کاتەوەی هەواڵی دەرچونی پێغەمبەرﷺو (أبوبکر) ﷺ بەرەو (یثرب)

ڕۆیشتنیان پێ دەگات هەمو ڕۆژێك دەچون بۆ ئەو دەشتەی نزیك قەراغی شار بو لەوێ چاوەڕێیان دەکرد.

کاتێکیش گەرما زۆری بۆ دەهێنان دەگەڕانەوە بۆ ماڵەکانیان، لە ڕۆژی دووشەممەی ڕێکەوتی (ربیع الاول)ی ساڵی سیانزەی پێغەمبەرایەتییەکەیﷺ دەگاتە (قباء) لەوێ موسڵمانان بە (الله اکبر) پێشوازی لێ دەکەن و سوپاسی خوای گەورە دەکەن لەسەر ئەوەی شەرەفی بینین و هاتنی پێغەمبەری بۆ شارەکەیان پێ بەخشیون.

پێغەمبەرﷺ چەند ڕۆژێك لە (قباء) دەمێنێتەوە، پاشان بناغەی مزگەوتی (قباء) کە یەکەم مزگەوتە لە ئیسلامدا دادەڕێژرێت، دوای ئەوە (علی کوڕی ابو طالب)ی پێ دەگات بۆ ماوەیەك لە مەککە مابویەوە، بۆ ئەوەی ڕاسپاردە و ئەمانەتەکانی، کە لە گەردنی پێغەمبەرﷺ بون بگەیەنێت بە خاوەنەکەی لە دوای بناغەدانانی مزگەوتی (قباء) پێغەمبەرﷺ و ئەوانەی لەگەڵیدا بون، لە (قباء)ەوە بەرەو ناوجەرگەی (یثرب) بەڕێ دەکەون، لەوێش موسڵمانان بەو پەڕی شادییەوە پێشوازی لێ دەکەن.

هەریەکێ لە موسڵمانان خوازیاری ئەوە دەبێت، کە پێغەمبەرﷺ لە ماڵەکەی ئەودا کۆچ و بار داگری و ببێتە میوانی، ئەوە بو هەریەکەیان دەیویست خۆی جڵەوی وشترەکە بگرێ و بە دەستی ئەو وشترەکە سرەوت بگری و وای لێبکات، کە چۆك دادات، پێغەمبەریشﷺ دەیفەرمو: (وازی لێ بهێنن، فەرمان پێ کراوە).

موسڵمانان وازیان لێ هێنا و ئازادیان کرد، ئەویش لە زەویەکەدا، کە موڵکی دوو هەتیو بو لە خێڵی (بني النجار)ی خاڵوانی (عبدالمطلب)ی باپیری پێغەمبەرﷺ وەستا پاشان چۆکی دادا.

ئەوجا دادەبەزێت و خێرا (ابو ایوب) وشترەکەی دەباتە ماڵی خۆیان و لە جێگایەکدا دایدەنێت، پێغەمبەریش ﷺ دەفەرموێت: (پیاو لەگەڵ وشتر و کۆچ و بارەکەیەتی ئەوان لە کوێ بن ئەویش لەوێ دەبێت).

پێغەمبەر ﷺ تا تەواو بونی مزگەوت و ژوری خێزانەکەی (کە دایکی موسڵمانانن) تەواو دەبن، لە ماڵی (ابو ایوب)دا دەمێنێتەوە و بە باشترین شێوە میوانداری دەکەن.

کۆچکردنی پێغەمبەر ﷺ بۆ (یثرب) لە پێناوی خوای گەورەدا دەبێت، جا لەو کاتەوەی لە (یثرب)دا جێگیر دەبێت، ناوی (یثرب) دەگۆڕێت بە (مەدینە).

موسڵمانەکانی خەڵکی ئەوێش نازناوی پشتیوان (أنصار)یان لێ دەنرێت و ئەوانەشی کە لە مەککەوە هاتون نازناوی کۆچکەر (مهاجرین)یان لێ دەنرێت، بێ گومان کۆچکردن سەرەتای قۆناغێکی نوێ دەبێت لە مێژوی ئیسلام دا، هەر بۆیە موسڵمانان ساڵی کۆچکردنەکە هەڵدەبژێرن بە سەرەتای دەست پێ کردنی مێژوی ئیسلامی و ئەو مێژوە بە مێژوی کۆچی ناودەبرێت.

## وانەی دووەم: دوای کۆچ

### (بنیات نانی مزگەوت و ژوری جێ نشین بونی):

پێغەمبەر ﷺ داوای لە دوو خاوەنی ئەو زەویە (کە وشترەکە چۆکی تێدادا) کرد ئەو زەوییەی پێ بفرۆشن ئەوانیش گوتیان:

(بەڵکو هەر بە گەردن ئازادی پێشکەشت بێت).

بەڵام پێغەمبەر ﷺ بەوە قایل نەبو، سور بو لەسەر ئەوەی بە پارە هەڵی بگرێتەوە، ئەوە بو رێك کەوتن و زەوییەکە مسۆگەر کرا، پاشان موسڵمانان دەستیان کرد بە دروستکردنی مزگەوتەکە، پێغەمبەری ئازیزیش ﷺ خۆشی یارمەتی ئیشکەرەکانی دەدا و بە دەستی خۆی کەرەستەی بیناکەی لەگەڵ دەگواستنەوە، مزگەوتەکە لە قوڕ و بەرد دروستکرا، کۆڵەکەکانیشی لە دار

خورما و هەندێ بەشی بە پەل و پۆ و قەدی دار خورما سەری بۆ کرا، بەشەکانی تریشی بەسەر بەتاڵی بەجێ هێڵرا. لە باری پێشەوەی مزگەوتەکەشدا مینبەرێك لە پەل و پۆی دار خورمای بۆ سازدرا.

لە دوای تەواو بونی مزگەوتەکە، هەر بەو شێوەیە چەند ژورێکی بۆ هاوسەرانی پێغەمبەرﷺ دروستکرا.

## (برایەتی نێوان پشتیوانان (انصار) و کۆچکردوان (مهاجرين)):

هەر بە دوای کۆچکردنی پێغەمبەرﷺ، کۆچی موسڵمانان لە مەککەوە بۆ (مەدینە) بەردەوام بو، تا وای لێهات ژمارەیەکی زۆر کەم لە موسڵمانان مانەوە. ئەم زیادکردنەی ژمارەی کۆچکردوان هاوکات بو لەگەڵ زیاد کردنی بڵاوبونەوەی ئیسلام لە نێو خەڵکی (مەدینەدا).

پێغەمبەرﷺ بە پێویستی زانی کە کۆمەڵگەیەکی ئیسلامی لەسەر بناغەی خۆشەویستی و برایەتی دامەزراو، دروستبکات، لەبەرئەوە پەیوەندی برایەتی نێوان کۆچکردوان و پشتگیری کەرانی پتەو کرد، داوای لە پشتگیرکەران کرد، هەر یەکێکیان یەکێك لە کۆچکردوان بکاتە هاوەڵ و هاوبەشی لە ماڵ و سامانیدا.

پشتیوانان پێداویستی برا کۆچکردوەکانیان لە پێش پێداویستی خۆیانەوە دادەنا.

کۆچکردوانیش شان بە شانی براکانیان لە بوارەکانی ژیاندا بە تایبەتی لە بواری بازرگانیدا کاریان دەکرد، چونکە ئەوان (قورەیشییەکان) لە بازرگانیدا چالاك و شارەزا بە ئەزمون بون، بەو شێوەیە پەیوەندی کۆمەڵگا ڕو لە پتەوی و ڕێکخستنی ڕیزەکانی بو، تا سەرەنجام موسڵمانان بونە گەلێکی ئیسلامی یەکگرتو.

لەو کاتەدا جولەکەکان خەتەرترین کۆمەڵی بێبڕوا بون لەبەر ئەوە پێغەمبەری خواﷺ ویستی پەیوەندی گەلی موسڵمانیان لەگەڵدا ڕێك بخات،

ئەوە بو پەیماننامەیەکی لە گەڵیاندا مۆر کرد و تیایدا پەیوەندی نێوانی رێك خستن، یەکێك لەو خاڵانەی لە رێکەوتننامەکەدا هاتبو، ئەوە بو جولەکەکان بێ خەم بن لە ئاین و ماڵ و سامانیان، بە مەرجێك لەگەڵ پێغەمبەری خواﷺ بوەستن لە دژی هەر دوژمنێك کە هێرش بەرێتە سەر (مەدینە).

## ئامادە کردنی موسڵمانان بۆ جیهاد:

لە دوای ئەوەی پێغەمبەرﷺ لە (مەدینە) کاروباری موسڵمانانی رێك خستو، کردنی بە بەرەیەکی یەکگرتو، ئەمە دڵی هاوەڵگەڕان و جولەکە و دووڕوەکان (المنافقون)ی داخوران، لەبەرئەوە هەر کۆمەڵێکیان بە پێی توانا و بە پێی شێوازی خۆی دەستی کرد بە پیلان دانان لە دژی موسڵمانان.

ئەوە بو کافران بەو هەمو ئازاردانی موسڵمانان و زەوت کردنی ماڵ و سامانیان، دڵیان ئاوی نەخواردەوە.

بەڵام هەر بەردەوام بون لەسەر بۆسە دانان و پیلان دانان بۆیان.

جولەکەکان لە پەیمانەکەیان پاشگەز بونەوە، جگە لەوە دەستیان کرد بە لەیەك کردنی موسڵمانان و ئاژاوە نانەوە لە نێوانیاندا، هەروەها دوژمنەکانیان هان دەدا، تا لێیان بدەن، دوو ڕوانیش دەستیان کرد بە ڕشتنی ژەهری خۆیان بە ناو کۆمەڵگەی موسڵماناندا.

بەڵام خوای گەورە موسڵمانانی بەسەر دوژمنانیاندا سەرخست و پێیانی لەسەر ڕەوا و ڕاستی جێگیر کرد.

خوای پەروەردگار رێی دا بە موسڵمانان لەگەڵ هاوەڵگەڕاندا - مشرکین - شەڕ بکەن، پاشان لە پێناو خوادا شەڕ کردن - جیهاد - ی فەرز کرد بەسەریاندا، پێغەمبەرﷺ و هاوەڵانی و شوێن کەوتوانی بەو پەری باوەڕ و لێ بڕانەوە جیهادیان دەکرد، جیهادی موسڵمانان لە شێوەی چەند (سرایا) و (غزوە) - غەزایەك - دا دەستی پێکرد..

ئـەو (سـرايا) و (غـزوات)ەيـان لـە دژی کاروانــە بازرگانــەکانی قورەیشـيان بەرپاکرد، گەورەترین ئامانجیش لەو کارە، تۆڵە سەندن بو لە قورەیشیەکان، چونکە دەستیان بەسەر مـاڵ و سـاماندا گرتبـو، هەروەها دابەزینی ئابوری قورەیشیەکان و لاواز کردنیان لە روی سەربازییەوە، یەکێك بو لە ئامانجەکان، بۆ ئەوەی رێگە بۆ بڵاوبونەوە و بانگێشەی ئیسلامی خۆش ببی و زەمینە تەخت ببێ.

یەکەم (سرية) کە پێغەمبەرﷺ بەرێی کرد ئەو سەریەیە بو، کە لە مانگی رەمەزانی ساڵی یەکەمی کۆچیدا ئامادە کراو لە (٣٠) پیاوی کۆچکردوان بە سەرۆکایەتی (حمـزة)ی کـوری (عبـدالمطلب) پێـك هـاتبو، یەکـەم غـەزاش، کـە پێغەمبەرﷺ کردبێتی، غەزای (ابواء) بو کە لە ساڵی دووەمی کۆچی دابو وە بە تەنها کۆچکردوانی لەگەڵدا دەرچو.

## غەزای گەورەی بەدر:

لە مانگی رەمەزانی ساڵی دووەمی کۆچیدا، پێغەمبەرﷺ هەواڵی پێ گەیشت، کە (ابو سفيان) بە کاروانێکی بازرگانی گەورەوە لە مەککەوە چوەتە دەرەوە و بەرەو شام بەرێ کەوتوە.

جا بۆ رێگرتن لەو قافڵەیە بە پەلە لەگەڵ زیاد لە (٣٠٠) کەس کە سێ بەشیان لە پشتیوانان (انصار) بون، لە مەککە دەرچو بەرەو (بدر) بەرێ کەوت، لە کاتێکدا کە بە تەنها (دوو وڵاخ) و (حەفتا وشتر)ی پێ دەبێت.

هەواڵی دەرچونی موسڵمانان بەرەو ئەو قافڵەیە دەگاتە گوێی (ابو سفيان) ئەویش چەند پیاوێکی خۆی دەنێرێت بۆ مەککە، تا غیرەتی پیاوانی قورەیش بجوڵێنن و هانیان بدەن بۆ یارمەتی دانیان بۆ رزگارکردنی ئەو قافڵە بازرگانییە.

ئەوەبو (ابو جهل) هەوڵی زۆریدا بۆ بزواندنی رقی قورەیشیەکان بەرامبەر موسڵمانان بەوە قورەیشییەکان بە لە خۆبایی بونەوە بە سوپایەکی زۆرەوە، کە

لە (٩٠٠) کەس و (١٠٠) ولاّخ و(٧٠٠) وشتر، پێك هاتبو دەرچون.

(ابو سفیان)، کە زانی موسڵمانانی لێ نزیك بوەتەوە ڕێی قافڵەکەی گۆڕی و بەرەو کەناری دەریای سور ڕێیگرتە بەر. کاتێکیش دڵنیا بو لە سەلامەتی و بە دووری قافڵەکەی لە هێرشی سوپای موسڵمانان، نوێنەری نارده لای قوڕەیشییەکان تا پێیان ڕابگەیەنێت چی تر نەیەنە پێشەوە و بگەڕێنەوە بۆ مەککە..ئەوە بو هەندێك لە سەرۆکە قوڕەیشییەکان قایل دەبن بە گەڕانەوە، بەلاّم (ابو جهل) دەتوانێت کاریان تێبکات و بەردەوام بن لەسەر بەڕێ بون بۆ پشتگیری کردن لە قافڵەکە. قوڕەیشییەکان دەگەنە (بدر) و بەو شێوەیە لەگەڵ موسڵماناندا بەرامبەر دەبن لەبەر ئەوە پێغەمبەرﷺ ڕاپرسی هاوەڵانی دەکات سەبارەت بە شەڕ کردن لەگەڵ قوڕەیشییەکاندا، ئەوە بو هەمو کۆچکردووان (مهاجرین) ڕایان لەگەڵ کردنی شەڕدا بو، پاشان جارێکی دی ڕاپرسیان لەگەڵ دەکاتەوە، ئەوانیش بە هەمان شێوەی جاری پێشو ڕەزامەندی دەردەبڕن، پێغەمبەرﷺ بۆ جاری سێیەم، ڕایان وەردەگرێت، (سعد)ی کوڕی (معاذ)ی پشتیوانیش دەڵێ: (ئەی پێغەمبەری خوا تۆ پێشمان کەوە، ئێمەش لە دواتەوەین، بەو کەسەی پەیامی ڕاستی پێدا ناردووی بۆ هەر شوێنێك بڕۆی هەمو لەگەڵتداین هیچ کەسێکمان دوا ناکەوێت، هیچ کاتێکیش لە ڕوبەڕوبونەوەی دوژمن سڵ ناکەینەوە و لە شەڕدا خۆگر دەبین و لە بەرەنگار بونەوەدا بە بڕوای پتەوە و دەجەنگین و پشت لە دوژمن ناکەین، هیواداریین خوای گەورە ئەوەت پێ نیشان بدات، کە چاوتی پێ ڕۆشن دەبێت و دڵتی پێ خۆش دەبێت، دە بە پشت بەستوریی بە خوای پەروەردگارمان پێش کەوە و با بەڕێ کەوین)، پێغەمبەرﷺ بە قسەکانی (سعد) دڵی خۆش دەبێت و ڕوی دەگەشێتەوە، ئینجا دەفەرموێت: (با بەڕێکەوین مژدەتان دەدەمێ، کە خوای گەورە دوو خەلاّتی پێ داوم).

پاشان بەرەو لای قورەیش بەڕێ دەکەون، تا لای نـزیکترین بـیر لـە بیرەکـانی (بدر) دەوەستن و کۆچ بار دادەنێن، ئینجا هەمو بیرەکانی پڕدەکەنـەوە، پاشـان حـەوزێکی گـەورە پڕدەکـەن لـە ئـاوی ئـەو بـیرە، کـە لـە لای دابـەزیون ئـەوجا پێغەمبەری خوا ﷺ کۆیان دەکاتـەوە و چـەند وتەیـەکیان پـێ دەفـەرموێت لـە وتەکانیـدا هـەڵیان دەنێـت بـۆ ئـەوەی لـە شـەڕدا خـۆڕاگر بـن و ریزەکانیـان بپارێزن، هەروەها داوا لە خوای پـەروەردگار دەکـات، کـە سـەرکەوتویان بکـات و شکست بە دوژمنانیان بهێنێ.

لـە بـەرە بـەیانی ڕۆژی (١٧)ی رەمـەزان، شـەڕ لـە نێـوان موسـڵمانان و قوڕەیشـییەکاندا دەسـت پێـدەکات، لـە ریـزی هاوەڵگەڕانـدا (عتبـە)ی کـوڕی (ربیعە) و (شیبە)ی برای و (ولید)ی کوڕی، دێنە دەرەوە و داوا دەکەن (سـیان) لـە موسـڵمانان بـۆ زۆرانبـازی کـردن لەگەڵیانـدا دەربچـن، ئـەو بـو سـیان لـە پشتیوانان (انصار) چونە پێشەوە لێیان.

سێ قوڕەیشییەکە گوتیان: (دڵنیا بن کە ئێوە بە جەرگ و ئازان، بەڵام ئێمە ئێوەمـان ناوێـت، حـەز دەکـەین لەگـەڵ ئـامۆزا قوڕەیشـیەکانی خۆمانـدا زۆران بگرین).

لەبەرئـەوە (حمـزە)ی کـوڕی (عبـدالمطلب) و (علـی)ی کـوڕی (ابـو طالـب) و (عبیـدە)ی کـوڕی (حـارث)یـان بـۆ دەچێتە دەرەوە، سـەرەنجام (علـی) (ولیـد) دەکوژی و (حمزە) (شیبە) لەناو دەبات و (عبیدە) و (عتبە)ش هەردووکیان لە یەکتری دەدەن، ئینجا (حمزە) و (علی) دەکەونە سەر (عتبە) و دەیکوژن.

پاشـان موسـڵمانان و هاوەڵگـەران دەکەونـە شـەڕێکی گەرمـەوە، سـەرەنجام موسڵمانان بەسەر بێ بڕوایاندا سەر دەکەون، لە ئاکامی ئەو شەڕەدا (٧٠) کـەس لە هاوەڵگەران دەکوژرێ لەوانە (ابو جهل) و (امیە)ی کوڕی (خلف).

هەروەها (٧٠)شیان لێ بەدیل دەگیرێت، لەوانە (عباس)ی کوڕی (عبـدالمطلب) و (عقیـل)ی کـوڕی (ابوطالـب)، ئـەوانی دیـش بـە هـەڵهاتویی دەگەڕێنـەوە بـۆ مەککە، بەڵام موسڵمانانیش (١٤) کەسیان لێ شەهید دەکرێت.

کاتێك شەڕ تەواو دەبێت و موسڵمانان شەهیدەکان دەنێژن.

پاشان بە سەربەرزی و دڵخۆشییەوە دەگەڕێنەوە بۆ (مەدینە) دەستکەوت و دیلەکانیش لەگەڵ خۆیاندا دەبەن.

لەوێ هەندێك لە دیلەکان بە (فدیة) خۆیان دەکڕنەوە و ئازاد دەبن، هەندێکیشیان بێ (فدیة) ڕزگار دەکرێن، (فدیە)ی کۆمەڵێکیان بریتی بو لە فێر کردنی خوێندنەوە و نووسین بە (١٠) منداڵ لە منداڵانی مەدینە. بەو شێوەیە خوای گەورە لە (بدر)دا کۆمەڵێك بڕواداری ژمارە کەمی سەرخست بەسەر کۆمەڵێك بێ بڕوای ژمارە زۆردا، ئەم شەڕە شەڕێکی زۆر گرنگ بو لە مێژوی ئیسلامدا و جیا کردنەوەی ڕەوا و ناڕەوا و سەرخستنی ڕەوا بو.

شایانی باسە لەم غەزایەدا خوای گەورە و باڵا دەست سێ پۆل فریشتەی دابەزاند، کە سەرجەم پێنج هەزار بون.

### وانەی سێهەم: هەردوو غەزای ( ئوحود ) و ( ئەحزاب )

### غەزای ( ئوحود ):

هاوەڵگەرانی قورەیشی بڕیاریاندا تۆڵەی ئەو شکستییە بکەنەوە، کە لە شەڕی (بدر)دا توشی هاتبون، لەبەرئەوەی زۆربەی سەرۆکەکانی قورەیش لە شەڕی (بدر)دا کوژرا بون، قسە هەر بۆ (ابوسفیان) بو، بڕیارەکان لەووەوە دەردەچون، (ابوسفیان) سەرۆکایەتی قورەیشی دەکرد و بە سوپێیەکی گەورەوە بەرەو (مەدینە) بەڕێ دەکەوێت و لە شاخی (ئوحود) نزیك دەبێتەوە، کە پێغەمبەرﷺ هەواڵی پێ دەگات پرس و رای لەگەڵ هاوەڵانیدا کرد، کە ئایا (وای بە باش دەزانن بۆ بەرەنگار بونەوەی کافران لە ـ مەدینە ـ بچنە دەرەوە، یان بمێننەوە لە ـ مەدینە ـ دا و جێی خۆیان قایم بکەن؟).

ئەوە بو ئەوانەی دەرفەتی بەشداری کردنیان لە شەڕی (بدر)دا لە دەست چو بو، زۆر بە گەرمییەوە داوایان لە پێغەمبەرﷺ کرد کە بچن بۆ بەرەنگار بونەوەیان.

پێغەمبەری ئازیزﷺ دەچێتە ماڵەوە و جلی شەڕ لەبەردەکات و پاشان بە (١٠٠٠) پیاوەوە لە ـ مەدینە ـ دەردەچێت و ڕوبەڕوی دوژمنان دەڕوات، لەم کاتەدا (عبدالله)ی کوڕی (ابي) دووڕو (منافق)، کارێکی وا دەکات کە نزیکەی (سێیەکی) سوپاکە دەگەڕێتەوە بۆ (مەدینە).

پێغەمبەرﷺ بە خۆی و سوپاکەیەوە بەردەوام دەبێت لە ڕۆیشتندا، تا لە ناوچەی (شعب)ی نزیك (احد) دادەبەزێت و سوپاکەی پشت دەکاتە شاخەکە، بۆ بەیانی ڕۆژی (شەممە) بەرواری (٧)ی شەوالی ساڵی سێیەمی کۆچی پێغەمبەرﷺ موسڵمانان کە ژمارەیان (٧٠٠) کەس دەبێت، ئامادە دەکات بۆ شەڕ، ئەوە بو (٥٠) کەسی لە تیر هاوێژەکانی ناردە سەر گردێك کە بەسەر مەیدانی جەنگدا دەیڕوانی و فەرمانی پێدان، کە شوێنی خۆیان بەجێ نەهێڵن و لە کاتی ڕوبەڕو بونەوەدا سواری هاوەڵگەران تیر باران بکەن. نەبادا لە دواوە پەلاماری موسڵمانان بدەن، هاوەڵگەرانیش بە سوپایەکی (٣٠٠٠) سێ هەزار کەسییەوە کە (٢٠٠)یان سوار بون ئامادەی جەنگ دەبن، لە قۆڵی ڕاستەوە سوپاکە (خالد)ی کوڕی (وەلید)ی تێدا دەبی و لە قۆڵی چەپیشەوە (عکرمە)ی کوڕی (ابوجهل).

شەڕ لە نێوان موسڵمانان و بێ بڕوایاندا دەست پێدەکات و پاشان گەرم دەبێت، لەو تێکۆشەرانەی کە بونە نمونەی موسڵمانی خۆفیداکار و گیان بەخش، (حمزة) و (علی) کوڕی (ابوطالب) و (ابو دجانة) و (سعد)ی کوڕی (ابي وەقاص) و (زبیر)ی کوڕی (عوام) و (طلحة)ی کوڕی (عبیدالله) بون.

لە شەڕدا تا دەهات موسڵمانان لە بەرەو پێشەوە چوندابون و بێ بڕوایانیش لە شکستی بەردەوام بون، کاتێ تیرهاوێژەکان پاشەکشێکەی بێ بڕوایانیان دیت، وا گومانیا برد، کە هاوەڵگەران بە تەواوی شکاون.

لەبەرئەوە بە مەبەستی کۆکردنەوەی ماڵ و تفاقانەی، کە لە هاوەڵگەران جێمابون شوێنەکانی خۆیان بەجێهێشت، هەرچەندە سەرپەلەکەیان فەرمانی پێدان، کە شتی وا نەکەن و جێگاکانیان چۆڵ نەکەن، بەڵام گوێیان بە قسەکەی نەدا و ڕۆیشتن، کاتێ ئەمان سەرگردەکە چۆڵ دەکەن، یەکسەر سوارچاکە بێ بڕواکان خۆیان دەگەیەننە شوێنەکەیان و پشت لە موسڵمانان دەگرن، پێغەمبەرﷺ بریندار دەکرێت و (٧٠) پیاویشیان لێ شەهید دەکرێت، لەوانە (حمزة)ی کوڕی (عبدالمطلب) و (مصعب)ی کوڕی (عمير).

موسڵمانان لەو شەڕەدا سەرکەوتوبون، تا ئەوکاتەی تیرهاوێژەکان لە فەرمانی پێغەمبەری خوا دەرنەچوبون و شوێنەکانیان بەجێ نەهێشتبو، بەڵام کە ئەوە ڕویدا و بێ بڕوایان جێگەکەیان گرت و توانیان تۆڵەیان لێ بکەنەوە، ڕۆژی (ئوحود) ڕۆژی تاقیکردنەوە و جیاکردنەوە بو، تێیدا خوای گەورە بڕواداران و دووڕوانی جیا کردەوە و دەری خستن، ڕێزی لەوانەش نا، کە دەیانویست بە پلەی (شهادة) شەهادەت ڕێزداربکرێن و بوە وانەیەکی لە یاد نەچو، کە هەرگیز موسڵمانان لە فەرمانی سەرکردەیان دەرنەچن.

## غەزای ( خەندەق ) یا ( ئەحزاب ):

لە دوای شەڕی (ئوحود) پیلانی جولەکە و دووڕوان، دژی موسڵمانان لە زیاد بوندا بو، موسڵمانانیش لە پێناوی خوای گەورە بەو پەڕی خۆگری و ئارامیەوە ڕو بە ڕویان دەبونەوە، لە ساڵی (پێنجەمی) کۆچیدا ژمارەیەك لە جولەکە دەچن بۆ مەککە و هانی قوڕەیشیەکان دەدەن تا بدەن بەسەر موسڵماناندا کە لە نێو (مەدینە)دا نیشتەجێ بون و خاوەن دەوڵەتی خۆیان بون، پەیمانیان دەدەنێ گەر ئەوان ئەوە بکەن ئەوا ئەمانیش ـ واتە جولەکەکان ـ پشتگیرییان دەکەن و یارمەتییان دەدەن، قوڕەیشییەکان ڕەزامەندیان بۆ جولەکە دەربڕی و پاشان جولەکەکان دەستیان کرد بە گەرم کردنی چەند خێڵێکی تریش بۆ

هێرش بردنە سەر موسڵمانان، ئەو خێڵانەش قسەکان وەردەگرن و کارەکە پەسەند دەکەن.

بەم شێوەیە دەستەی هاوەڵگەران پۆل پۆل ڕو دەکەنە (مەدینە)، تا وای لێ دێ لە مانگی شەوالی ئەم ساڵەدا (١٠) هەزار شەڕکەر بە مەبەستی بەسەرددانی موسڵمانان و لەناوبردنی بڕواداران کۆدەبنەوە.

پێغەمبەرﷺ ئاگاداری هەمو جموجۆڵێکی دوژمنانی دەبی و سەبارەت بە چۆنیەتی بەرەو ڕوبەڕوبونەوەیان ڕاپرسی لەگەڵ هاوەڵانی دەکات.

یەکێك لە هاوەڵان، کە (سلمان)ی فارسییە ڕای وا دەبێت لە شوێنێکی دەرەوەی (مەدینە)دا، کە شاخ نەبێت، (خەندەق)ێك لە نێوان ڕێی (مەدینە) و دوژمنانیدا هەڵبکەنن.

پێغەمبەرﷺ ڕاکەی (سلمان) پەسند دەکات و، فەرمان دەدات خەندەقێکی گەورە هەڵبکەنن، سەرجەم موسڵمانان بەشداری لە هەڵکەندنی ئەم خەندەقەدا دەکەن، ئەو غەزایە ناونرا غەزای (الخندق) هەروەها غەزای (ئەحزاب) واتا (کۆمەڵ و لایەنەکان)یشی پێ گوترا.

لەبەرئەوەی دوژمنە خۆ ئامادەکەرەکان بۆ ئەو شەڕە لە چەند تیرە و خێڵ و کۆمەڵێك پێك هاتبون. دوای ئەوەی ئەو کۆمەڵە خێڵە لە (مەدینە) نزیك بونەوە، پێغەمبەرﷺ بە (سێ) هەزار تێکۆشەرەوە بۆیان دەرچو، پێغەمبەرﷺ فەرمانی دابو خەندەقەکە لە شوێنێکدا هەڵبکەنرێت، کە لە پشتەوە بە ڕوی مەدینەدا شاخێك هەبێت، واتە خۆی و سوپاکەی بکەونە نێوان شاخەکە و خەندەقەکە، لەم کاتەدا جولەکەکانی (بنو قریضة)ش چونە پاڵ (ئەحزاب)، بەمە ترسی موسڵمانان زیادی کرد.

(ئەحزاب) لە شوێنی خۆیاندا ـ کە لەبەردەم خەندەقەکە بوـ بۆ ماوەی مانگێك مانەوە، بەردەوام لەگەڵ موسڵماناندا تیربارانی یەکتریان دەکرد، ڕۆژێکیان چەند کەسێك لە سوار چاکانی بێ بڕوایان توانییان چاڵەکە ببڕن، ئینجا داوای زۆرانبازییان لە موسڵمانان کرد، (علی) کوڕی (ابوطالب)یش

دەچێتە پێشەوە و لەگەڵ ئازاترینیاندا بەشەڕ دێت و دەیکوژێت، بەوە ئەوانی تر چاوترس دەبن و دەگەڕێنەوە ناو کۆمەڵگەی خۆیان.

خوای گەورەش ڕێی سەرکەوتن و رزگار بونی موسڵمانان ئاسان دەکات، ئەوە بو کابرایەك لە (غطفان) کە ناوی (نعیم)ی کوڕی (مسعود) دەبێت، دەچێتە لای پێغەمبەرﷺ موسڵمان بونی خۆی ڕادەگەیەنێت، ئەم کابرایە بەهۆی زیرەکی و بەهۆی باش پەیوەندی بە هاوەڵگەران و جولەکەوە، بە کارێکی زۆر مەزن هەڵدەستێت، ئەویش ئەوەیە کە دەتوانێت گومان بخاتە دڵی هەریەك لە هاوەڵگەران و جولەکەوە بەرامبەر یەکتر.

ئەم کارە کاریگەری زۆری دەبێت بۆ لاواز بونی پەیوەندی نێوان هاوپەیمانان و بڕوانەمانیان بە یەکتری پاشان خوای گەورە گەردە لولێکیان بۆ دەنێرێت و بەهۆیەوە چادری هاوەڵگەران هەڵدەکەنرێت و دارو پەردوویان تێك دەدا، هەر شتەیان بە لایەکدا دەڕوات، بەمە هەمویان ترس دەیانگرێت و بە پەلە بەرەو ڕوی شوێنەکانی خۆیان بە ڕو زەردی دەگەڕێنەوە.

خوای گەورەش لە سورەتی (أحزاب)دا ئەم غەزایە دێنێتە یادی بڕوادارن و دەفەرموێت: ﴿إِذْ جَآءَتْكُمْ جُنُودٌ فَأَرْسَلْنَا عَلَيْهِمْ رِيحًا وَجُنُودًا لَّمْ تَرَوْهَا ۚ وَكَانَ ٱللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرًا﴾[١].

واتە: (ئەی ئەو کەسانەی ئیمان و باوەڕتان هێناوە یادی ناز و نیعمەتەکانی خواوەند لەسەرتان بکەنەوە، بە تایبەتی ئەو کاتانەی کە سەربازانێك هێرشیان هێنا بۆتان، ئێمەش باو گەردەلول و سەربازانی خۆمانمان نارده سەریان کە ئێوە نەتان دەدیتن، بێ گومان خواوەند بە کردەوەکانتان بینایە).

---

١ـ الأحزاب/٩.

## وانەی چوارەم: ڕیکەوتننامەی ( حدیبیة )

لە پاش تێپەڕبونی چەند مانگێك بەسەر شەڕی (خندق) کە تێیدا خوای گەورە شکستی بە (احزاب) هێنا و هەڵگرانی پەیامی خۆی و سەربازانی ئیسلامی سەرخست موسڵمانان سەرکەوتنێکی تریان بە دەست هێنا، ئەویش سەرکەوتن بو بەسەر خێڵی (بنو قریظة)ی جولەکەدا، کە لەگەڵ کۆمەڵی هاوەڵگەڕاندا هاوپەیمان بون.

موسڵمانان هەمیشە بە تەنگ بەجێ هێنانی (عمرە) و زیارەتی (کعبە)وە بون، کە لە یەکەم ساڵی کۆچکردنەوە کرا بە قیبلەی موسڵمانان و ماڵی خوا، هەروەها زۆربەی کۆچکردوان یادگاری تایبەتی خۆیان سەبارەت بە (کعبە) هەبو، زۆر بە پەرۆشبون بە سەردانی و سوڕانەوە بە دەوریدا، بەڵام قوڕەیش موسڵمانانیان قەدەغە کرد لە چونە ناو مەککەوە، لە کاتێکدا ڕێیان بە کەسانی دی دەدا، کە سەردانی مەککە بکات پێغەمبەرﷺ بە پەرۆشەوە بو بۆ سەردانی ماڵی خوا.

ڕۆژێکیان پێغەمبەرﷺ باسی خەونێکی خۆی بۆ یەکێك لە هاوەڵانی دەگێڕێتەوە دەڵێت: (لە خەونمدا بینیم موسڵمانان بە پشتیوانی خوای گەورە بێ ترس و قژ کورتکراوەیی و سەرتراشاوییەوە سەردانی ماڵی خوایان دەکرد) بە گێڕانەوەی ئەو خەونە موسڵمانان هیوادار دەبن، کە سەردانی ماڵی خوا بکەن و (عومرە) بەجێ بهێنن.

مانگی (ذي القعدة) ساڵی شەشەمی کۆچی، پێغەمبەرﷺ بە مەبەستی بەجێ هێنانی (عومرە) لەگەڵ (١٤٠٠) هەزار و چوارسەد کەس لە شوێن کەوتوانی، لە (مەدینە) دەردەچێت و ژمارەیەکی زۆر وشتر لەگەڵ خۆی دەبات، ئەو کات هەواڵ دەنێرێت بۆ ئەو خێڵانەی، کە لەسەر ڕێگای مەککەن و لەوەوە نزیکن کە موسڵمانان شەڕیان ناوێت، بەڵکو دەیانەوێت تەنها سەردانی ماڵی پیرۆزی خوا بکەن و (عومرە) بەجێ بهێنن، موسڵمانان بەردەوام دەبن لە ڕۆیشتن تا دەگەنە ناوچەی (حدیبیە) کە چەند میلێك لە مەککەوە دوورە هەندێ لە

سەرۆکەکانی قورەیش گومانی ئەوەیان کرد، کە مەبەستی سەرەکی موسڵمانان لە چونەکەیاندا دەست گرتنە بەسەر شارەکەدا و ئەو کارەیان وەڵامدانەوەیەکی غەزای (احزاب)ە.

لەگەڵ ئەوەشدا هەمو لەسەر ئەوە رێك کەوتن، کە رێ بە موسڵمانان نەدەن بچنە مەککەوە، ئیدی چونەکەیان بە هەر مەبەستێك بێت، پاشان سوپایەکیان بە سەرۆکایەتی (خالد)ی کوڕی (ولید) و (عکرمة)ی کوڕی (ابوجهل) ناردە دەرەوەی شار، تا رێ لە موسڵمانان بگرن لە هاتنە ناوەوەیان بۆ مەککە، هەروەها نەبادا خێڵەکانی تری عەرەب ئەو هاتنە ژورەوەیان (ناوەوە) بۆ مەککە بە لاوازی بۆ قورەیش لە قەڵەم بدەن.

پێغەمبەرﷺ بە تەنگ ئەوەوە بو کە (عمرە) بە رێگەیەکی ئاشتییانە بکرێت، لەبەر ئەوە (عثمان)ی کوڕی (عفان)ی نارد بۆ ناوەوەی مەککە تا بۆ سەرۆکەکانی دووپات بکاتەوە، کە موسڵمانان بۆ شەڕ نەهاتون، بەڵکو بۆ (عمرە) هاتون، بەڵام ئەو سەرۆکانە بە (عثمان)ی کوڕی (عفان) رادەگەیەنن، کە سوێندیان خواردووە نەهێڵن ئەمساڵ موسڵمانان بێنە مەککەوە.

(عثمان)ی کوڕی (عفان) بۆ ماوەیەك لە مەککە دەمێنێتەوە، لەوکاتەدا کە ئەو لەوێ دەبێت، هەواڵێکی وا دەگاتە پێغەمبەرﷺکە (عثمان) کوژراوە، لەبەرئەوە بڕیار دەدات شەڕ لەگەڵ قورەیشییەکاندا بکات، لەبەر ئەوە موسڵمانان بانگدەکات، تا بەڵێنی لەگەڵ بونی پێبدەن، ئەوانیش لە ژێر ئەو درەختەدا، کە پێغەمبەری خۆشەویستﷺلە سێبەریدا دەحەوایەوە، بەڵێنیان پێیدا لە شەڕدا هەڵنەیەن و لەگەڵ بڕیارەکانی ئەو دابن، لە دوای بەڵێن پێدانی یەکە بە یەکەی موسڵمانان، پێغەمبەرﷺ هەردوو دەستی دەدات بە یەکدا و دەفەرموێت: (ئەمەش لە جیاتی دەستی عثمان) ئەو بەڵێنە بە بەڵێنی (بیعە)ی رەزامەندی (رضوان) ناو دەنرێت، چونکە خوای گەورە لە بارەیەوە

دەفەرموێت: (لَّقَدۡ رَضِيَ ٱللَّهُ عَنِ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ إِذۡ يُبَايِعُونَكَ تَحۡتَ ٱلشَّجَرَةِ)[١].

لەگەڵ تەواو بونی بەڵێنی (رضوان)دا (عثمان)ی کوڕی (عفان) دەگەڕێتەوە لە مەککە، پاشان قوڕەیش بە مەبەستی ڕێککەوتن یەك لەسەر یەك نوێنەر دەنێرنە لای پێغەمبەرﷺ لە دواییدا هەردوولا دەگەنە ڕێك کەوتنێك و ناوی ڕێککەوتننامەی (حدیبیە)ی لێ دەنێن، گرنگترین ئەو خاڵانەی لە ڕێککەوتننامەکەدا هاتبون ئەمانەن:

١ـ چونە مەککە و (عمرە) کردنی موسڵمانان بخرێتە ساڵی داهاتو.

٢ـ شەڕ لە نێوان هەردوو لادا بۆ ماوەی (١٠) ساڵ بوەستێنرێت.

٣ـ هەمو ئەو کەسانەی بە بێ ئاگاداری کەس و کاریان پەیوەندی بە موسڵمانانەوە دەکەن، دەبێ موسڵمانان بیانگێڕنەوە بۆ قوڕەیش، بەڵام ئەوانەی کە موسڵمانن و پەیوەندی بە قوڕەیشەوە دەکەن لەسەر قوڕەیش پێویست نییە بیانگێڕێتەوە بۆ نێو موسڵمانان.

٤ـ سەرپشك بونی خێڵەکان لەوەدا بچنە پاڵ موسڵمانان یان بچنە پاڵ قوڕەیش، کە ئەم ڕێککەوتننامەیە ساز درا، خێڵی (خزاعە) چوە پاڵ موسڵمانان و خێڵی (بکر) چوە پاڵ قوڕەیش.

لە دوای نوسینەوەی ئەم ڕێککەوتننامەیە پێغەمبەرﷺ فەرمانی بە هاوەڵانی دا، کە قوربانییەکان سەرببڕن و سەروقژیان بتاشن، یا کورتی بکەنەوە، ئەوانیش فەرمانەکەیان بەجێ هێنا، پاشان لە (حدیبیة) گەڕانەوە بۆ (مەدینە).

لەگەڵ ئەوەدا، کە هەندێ لە هاوەڵانی (ڕەزا و ڕەحمەتی خوایان لێ بێت) لە سەرەتا بە هەمو ئەو خاڵانە قایل نەبون، کە لە ڕێککەوتننامەکەدا هاتبو، لە

---

١ـ الفتح/١٨.

دوایدا هەمو باوەڕیان بەوە هێنا، کە پێغەمبەرﷺ بڕیار لەسەر هەرچییەك بدات، ئەوا ئەو شتە خەیر و چاكەیە بۆیان. لە ڕاستیدا هەر ئەوە خێر بو.

ڕێككەوتننامەی (حديبية) دەرفەتی بێ ترس بڵاوكردنەوەی پەیامی خوای گەورە بۆ موسڵمانان ڕەخساند و بەمە بەشێكی زۆر لە عەرەب بونە موسڵمان، هەروەها ئەو ڕێككەوتننامەیە هەلێك بو بۆ موسڵمانان تا لەگەڵ دوژمنیاندا - بێجگە لە قوڕەیش - بجەنگێن و سەركەون بەسەریاندا.

باشترین بەڵگە لەسەر مەزنی و پیرۆزی ڕێككەوتننامەی (حديبية) ئەو سورەتەی قورئانی پیرۆز بو، كە لەسەری دەدوێت و بە (فتح مبين) وەسفی دەكات.

## وانەی پێنجەم: پاش ڕێككەوتننامەی (حديبية)

### غەزای تبوك:

پێشتر ئاماژە بۆ ئەوە كرا، كە یەكێك لە سودەكانی (حديبية) ڕەخساندنی دەرفەت بو بۆ موسڵمانان، تا هێزی جولەكەی (خيبر) لە ناوبەرن، هەروەها گەیاندنی ئاینەكە بو بەو شوێنانەی، كە پێش بەستنی پەیمانەكە پێیان نەگەیشتبو، پێغەمبەرﷺ بە مەبەستی بڵابونەوەی پەیامەكەی خوای گەورە نامەی بۆ فەرمانڕەوا و پاشاكانی ناو دوورگەی عەرەب و دەرەوەی دەنارد و بۆ ئیسلام بانگی دەكردن.

ئەو پاشایانەی هەیانبو موسڵمان دەبو هەشیان بو موسڵمان نەدەبو، بەڵام بە شێوەیەكی جوان و باش وەڵامی نامەكەی دەدایەوە، هەبو سەركێشی دەكرد و بە شێوەیەكی ناشیرین و خراپ وەڵامی دەدایەوە، تەنانەت یەكێك لە فەرمانڕەواكانی (غەسانییەكان) لە سنوری شام دا، نامە بەرەكە دەكوژێت.

لە دوای ئەوە پێغەمبەرﷺ سوپایەكی (سێ هەزار) كەسی بۆ لای غەسسانییەكان دەنێرێت، تا تۆڵەیان لێ بكاتەوە و وایان لێبكات جارێكی تر

نەوێرن کاری وا ناڕەوا بکەن، کاتێك موسڵمانان دەگەنە سنوری شام، دەبینن چەند کۆمەڵێکی زۆر گەورەی پێك هاتو لە عەرەب و ڕۆم، کە ژمارەیان لە (چل هەزار) شەڕکەر زیاتر بو کۆبونەتەوە و ئامادەی جەنگن.

موسڵمانان لە ناوچەی (مؤتة)دا لەگەڵیاندا بەشەڕ دێن، سێ کەس لەوانەی لەو شەڕەدا ئاڵای ئیسلامییان هەلگرتبو دەکوژرێن، ئەوانیش (زید)ی کوڕی (حارثة) و (جعفر)ی کوڕی (ابوطالب) و (عبدالله)ی کوڕی (رواحه) بون، پاش ئەوانیش (خالد)ی کوڕی (وەلید) ئاڵایەکە دەگرێتە دەست و لە دوای ئەوە سوپای موسڵمانان ئازایەتی و نەبەردییەکی مەزن دەنوێنن، (خالد) پاشەکشێیان پێ دەکات و سوپای موسڵمانان دەگەڕێتەوە، ئەم غەزایە بە غەزای (مؤتة) دەناسرێت.

پاش ئەوەی موسڵمانان مەککە ڕزگاردەکەن و لە حونەین دا سەرکەوتن بە دەست دەهێنن، هەروەها زۆربەی خەڵکی ناوچەی (حجاز) زۆربەیان موسڵمان دەبن، ئەو عەرەبانەی پاشکۆی (ڕۆم)ن و بونەتە پیاوی ئەوان ترسیان لە هێزی موسڵمانان لا پەیدا دەبێت.

لەبەرئەوە بە مەبەستی لێدانی موسڵمانان لە ڕۆمەکاندا خۆیان ئامادە دەکەن، پێغەمبەرﷺئەو کاتە بە هەل دەزانێت بۆ بڵاوبونەوە و گەیاندنی پەیامی خوای گەورە بە خەڵکی باکوری دوورگەی عەرەب و نیشاندانی هێز و توانای موسڵمانان بە عەرەب و ڕۆمەکانی ئەوێ.

بەو شێوەیە هەردوو تیمەکە بڕیار لەسەر دەرچونی سەربازی دەدەن، پێغەمبەرﷺ بە باشی دەزانێت، کە جڵەوی دەست پێشخەری لە دەست خۆیاندا بێت.

هەر بۆیە فەرمان دەدات بە موسڵمانان بۆ غەزا کردن، ئەو کاتە کاتێکی زۆر گەرم دەبێت و ساڵەکەشی زۆر ووشك دەبێت و خەڵکی لە تەنگاوی و بێ دەرامەتیدا دەبن.

لەبەرئەوە بە خەڵکی ڕادەگەیەنێت تا لە پێناوی خۆئامادە کردن بۆ شەڕ پارە و ماڵ ببەخشن، ئەوە بو موسڵمانان لە بەخشین دا پێشبڕکێیان دەکرد، ابوبکر ﷺ تەواوی سامانەکەی دەدات، لە پێناوی خوادا دەیبەخشێت و (عثمان)ی کوڕی (عفان)یش بەشێکی زۆری سامانەکەی دەدات، وەنەبێت بڕواداران هەر ماڵ و سامان ببەخشن، بەڵکو گیانیشیان دەبەخشن، ژمارەیەکی زۆریان بۆ خۆبەخت کردن خۆیان ئامادە دەکەن، هەر بۆیە ژمارەی جەنگاوەران دەگاتە (چل هەزار) سوارچاك، بەڵام دووڕووەکان - کە سەرۆکەکەیان (عبدالله)ی کوڕی (ابی)یە - لە جیهاد دوا دەکەون و بەشداری ناکەن.

پێغەمبەرﷺ لە مانگی (رجب) ساڵی نۆیەمی کۆچیدا لەگەڵ موسڵماناندا لە مەدینە دەردەچێت و بەڕێ دەکەوێت، تا دەگاتە ناوچەی (تبوك)، لەو کاتەدا ڕۆم و هاوپەیمانیان لە عەرەب ئەو نەبەردی و ئازایەتییەی موسڵمانان - کە تەنها سێ هەزار کەس بون - یان بیر دەکەوێتەوە، کە لە شەڕی (مؤتە)دا نواندبویان، جا کە دەزانن ژمارەی ئەو سوپایەی ڕویکردۆتە (تبوك) (چل هەزار) کەس دەبێت، لە بڕیاری بەرەنگار بونەوەیان پەشیمان دەبنەوە و هاوپەیمانیان نامێنێت.

پێغەمبەرﷺ زیاد لە (دە ڕۆژ) لە (تبوك) دەمێنێتەوە، لەو ماوەی ئەو ڕۆژانەدا پەیمان لە فەرمانڕەوایانی ئەو کۆمەڵ و شوێنانە وەردەگرێت، کە دڵنیا بن لە گیان و ماڵ و سامانیان و (جزیة) بدەن بە موسڵمانان، پاشان (خالد)ی کوڕی (ولید)یش کۆمەڵێك لە موسڵمانان دەبات و ڕودەکاتە ناوچەی (دومة الجندل) و پاکی دەکاتەوە لە دوژمنکاران و خەڵکەکەی ڕزگار دەکات.

بەو شێوەیە پێغەمبەرﷺ هێز و توانای موسڵمانان بۆ ڕۆمەکان و هاوپەیمانەکانیان دەردەخات و دادی ئیسلامی بەسەر باکوری دوورگەی عەرەبیدا دەبەخشێت.

ئینجا موسڵمانان بەسەربەرزی و سەرفرازییەوە دەگەڕێنەوە بەرەو مەدینە.

**هەڵوێستی جولەکە بەرامبەر ئیسلام:**

پێش ئیسلام جولەکەکان شانازی ئەوەیان بەسەر عەرەبەکاندا دەکرد، کە ئەوان خاوەن پەیامێکی خواییین و ئەو پەیامە پەیڕەو دەکەن.

هەروەها دەیانگوت بەم ڕۆژانە پێغەمبەرێك دێت و سەربەرزی و سەرفرازی تا ڕۆژی دوایی بۆ ئەوانە دەبێت، کە شوێنی ئەو دەکەون، کاتێکیش ئەو پێغەمبەرەی باسیان لە هاتنی دەکرد، لە ناو عەرەبدا سەری هەڵدا پێی دلگران بون باوەڕیان بە پێغەمبەرایەتییەکەی نەدەکرد، پاشان پێغەمبەرﷺ کۆچ دەکات بۆ (مەدینە) و خێڵەکانی (بنو قینقاع و بنو نضیر و بنو قریضة)ی تێدا دەبێت، هەوڵ دەدات پەیوەندییەکی پتەویان لەگەڵ ببەستێت، یەکێك لەو کارە سەرەتاییانەی لەگەڵیاندا ئەنجامی دەدات، نواندنی مامەڵەی باشە لەگەڵیاندا، هەروەها نووسینی پەیماننامەیەك لە نێوان خۆی و ئەواندا، کە تیایدا چەند مافێکیان بۆ دابین بکات.

لەوانە: مانەوەیان لەسەر ئاینی باب و باپیریان، بە مەرجێك لەگەڵ موسڵماناندا بەرامبەر دوژمن بوەستن بەڵام جولەکە پاساوی چاکە بە خراپە و ئەمەك و پاکی بە ناپاکی دەدەنەوە، جولەکە وێڕای ئەوەی دەیانزانی کە پەیامەکەی پێغەمبەرﷺ ڕاست و ڕەوایە، نکوڵییان لێدەکرد و دژی دەوەستان، هەوڵیان دەدا خەڵکی لە ئیسلام دوور بکەونەوە، جگە لەوە گومانیان بەرامبەر بنەما و ڕێساکانی ئیسلام بۆ خەڵکی دروستدەکرد، نەك هەر ئەوە، بەڵکو وایان ڕادەگەیاند بت پەرستی لە ئیسلام چاکترە.

جولەکە هەمو ڕێگایەکیان گرتە بەر بۆ دژایەتی کردنی ئیسلام و موسڵمان، وەنەبێت ئەو هەڵوێستە دژایەتیکردنی بە تەنها هەڵوێستی کۆمەڵێکیان بێت، بەڵکو هەر هەمویان کاریان دژی موسڵمانان دەکرد، لەبەرئەوە موسڵمانان ناچاربون بەرامبەر هەریەك لەو کۆمەڵانە هاوهەڵوێستی جیا و شایەن بە خۆیان هەبێت لەگەڵیاندا.

## هەڵوێستی موسڵمانان بەرامبەر بە خێڵەکانی جولەکە:

### هەڵوێستی موسڵمانان بەرامبەر جولەکەی (بنو قینقاع):

خێڵی (قینقاع) لە دەوڵەمەندترین خێڵی جولەکەکانی ناو مەدینە و دەوروپشتی بون و زۆربەیان زەرنگەر و زیوفرۆش و چەکساز بون، ئەم جولەکانە بەرز بونەوەی ئیسلام و شانی موسڵمانیان زۆر پێ ناخۆش بو، بە تایبەتی لە دوای غەزای (بدر)ەوە، ئەوە بو نەیانتوانی ڕق و کینەی بەرامبەر موسڵمانان بشارنەوە، بەڵکو بە وتەی ناشیرین و سوکایەتی کردنەوە باسیان دەکردن.

(ڕۆژێك لە ڕۆژانی مانگی شەوالی ساڵی دووەمی کۆچی، ئافرەتێکی موسڵمان بە نیازی کڕینی پێویستییەکی لای یەکێك لە زەرنگەرەکانیان، دەچێتە بازاڕەکەیانەوە لەوێدا ژمارەیەك لە جولەکە دەوری لێدەگرن و بە شێوەیەکی زۆر ناشیرین و خراپ ڕەفتار دژی دەنوێنن، ئافرەتەکە هاوار لە موسڵمانان دەکات و داوایان لێدەکات بە دەمیەوە بچن، موسڵمانێکیش ڕادەپەڕێت، ئەو جولەکەیە (کە لەوانی تر زیاتر ئازاری ئافرەتەکە دەدات) دەکوژێت، جولەکەکانی تریش دەکەونە سەر موسڵمانەکە و دەیکوژن، ئەوسا لە بەرامبەر ئەو هەڵوێستە ناشیرینەی خێڵی (بني قینقاع)، پێغەمبەرﷺ لەگەڵ ژمارەیەك لە هاوەڵانیدا دەچن بۆ لای گەورەکانیان و ئاگاداریان دەکاتەوە، لەوە چیدی ڕەفتاری ناشیرین نەنوێنن.

بەڵام ئەوان بە بەرەنگار بونەوە و دژایەتی و قسەی بەرز و نزمەوە وەڵامیان دەدەنەوە، پاشان پێغەمبەرﷺ لەگەڵ کۆمەڵێك لە موسڵمانان بۆیان دەردەچن و ماوەی (١٥) ڕۆژ گەمارۆی قەڵاکانیان دەدات، پاشان چەکیان دەکات و لە مەدینە دووریان دەخاتەوە، ئەوانیش ماوەیەك لە دۆڵی (قری)دا دەمێننەوە ئینجا بەرەو سنوری شام بەڕێ دەکەون)[١].

---

١ـ ضعيف: ضعفه الألباني في كتابه (دفاعاً عن السنة و رداً عن جهالات البوطي).

## هەڵوێستی موسڵمانان بەرامبەر خێڵی ( بنو نضیر ):

خێڵـی (بنونضـیر) دەرك بـەوە دەكـەن (هـەروەك چۆن جولەكـەكانی تـر دەركیـان بـەوە كردبـو)، كـە موسـڵمانان ڕۆژ لـە دوای ڕۆژ لـە زیـاد بـون و قـایمكردنی جـێ پێیـان دان، لەبەرئـەوە بـە پێویسـتیان زانـی خۆیـان لـە پێغەمبەرﷺ ڕزگار بكەن و لەناوی بـەرن تـا ئیسلام و موسڵمانان كۆتـایی پـێ بێت و نەمێنێت.

ئەوە بو لە (ربیـع الأول)ی ساڵی چوارەمی كۆچیدا پێغەمبـەرﷺ دەچێتە لایان و داوایان لێ دەكات یارمەتی بدەن لە دابین كردنـی خـوێنی دوو پیـاودا، وا گومان دەبەن كە ئەم هاتنە دەبێت سـودی لێ وەرگـرن، لەبەرئـەوە خۆشـحاڵی و ڕەزامەندی نیشان دەدەن، ئینجا هەوڵ دەدەن كە بـەردێكی گـەورە لـە سـەربانی ماڵێكەوە بدەن بەسەر پێغەمبەرﷺ ، بەڵام خوای گەورەش فریـای دێـت و لـەو پیلانـەیان ئاگـاداری دەكاتـەوە، ئـەویش هەڵدەسـتی و ماڵەكـە بـەجێ دێڵـی و دەگەڕێتەوە بۆ مەدینە.

هەرئەو كارە خیانەت ئامێزەیان هۆیەك دەبێت بۆ دەرچـونی پێغەمبـەرﷺ و موسـڵمانان بـە مەبەسـتی شـەڕ كـردن لەگەڵیانـدا، مـاوەی (شـەش شـەو) موسڵمانان لە قەڵایەكدا گەمارۆیان دەدەن، ئینجا جولەكە داوا لە پێغەمبەرﷺ دەكـەن گـەمارۆیان لەسـەر نـەهێڵێت، دەڵـێن: ئێمـە ئامـادەین بـە بـێ چـەك لـە مەدینە دەربچین، پێغەمبەریشﷺ داواكارییەكەیان پەسند دەكات، پاشان ڕێـی لـە مەدینـە دەرچـونیان دەدات، بـەو شـێوەیە هەنـدێكیان بـەرەو (خیـبر) و هەندێكیان بەرەو (شام) كۆچ دەكەن.

## هەڵوێستی موسڵمانان بەرامبەر خێڵی ( بنو قریضة ):

خێڵی (بنو قریضة) دوا كۆمەڵ بون، كەلە مەدینەدا مابونەوە، وا چاوەڕوان دەكرا، كە پەندیان لە ڕوداوەكان (بەهۆی ناپاكییەوە)، كە بەسـەر جولەكـەكانی تردا هاتبو وەرگـرتبی و دەركیـان بـەوە كردبـێ، كـە ئاكـامی ناپـاكی و خیانـەت

قورس و گرانە، بەڵام کاتێ ئەم خێڵە (احزاب)یان لە شەڕی (خندق)دا بینی، ئەو گومانە ختوکەی دڵی دان کە توانای لەناو بردنی موسڵمانانیان هەیە سەرەنجام دەستیان خستە نێو دەستی ئەو کۆمەڵە (احزاب)ەو پەیمانی یەك دەستیان لەگەڵ بەستن.

پێغەمبەرﷺ (سعد)ی کوڕی (معاذ)ی - کە پێشتر پەیوەندی لەگەڵ جولەکەکاندا باش بو - ناردە لایان، تا لە هەڵوێستیان دڵنیا بێت، ئەوانیش پێی ڕادەگەیەنن، کە لەسەر ئەو پەیمانە نەماون، کە پێشتر لەگەڵ پێغەمبەرﷺ کردبویان، بەو شێوەیە لە ناسکترین کاتی موسڵماناندا ئەمانیش دژایەتی خۆیان ڕادەگەیەنن.

لەبەرئەوە پێغەمبەرﷺ لەگەڵ کۆمەڵێك لە موسڵمانان بەرەو ڕوی قەڵاکانیان بەڕێ دەکەوێت، بۆ ماوەی (بیست و پێنج شەو) گەمارۆیان دەدات، پاش ئەو ماوەیە (بنو قریضة) مل بۆ بڕیار و فەرمانی پێغەمبەرﷺ دەدەن، ئەوە بو بەهۆی ناپاکی و پەیمان شکاندن و خیانەتکارییەوە دادگایی کران و حوکمی پێویستیان بەسەردا درا.

بەو پێیە مەدینە کە بوبویە بنکەیەك بۆ دەوڵەتی ئیسلامی لەو کۆمەڵە جولەکە ناپاك و بێ بەڵێنەش (کە هەردەم خەریکی دژایەتی کردنی موسڵمانان بون) پاك کرایەوە.

## هەڵوێستی موسڵمانان بەرامبەر جولەکەی ( خیبر ):

ناوچەی (خیبر) دەوڵەمەنترین ناوچەی دوورگەی عەرەب بوو، لە کشتوکاڵدا بە تایبەتی لە دار خورمادا، لەو ناوچەیەدا ژمارەیەکی زۆر لە جولەکە جێگیر دەبن کاتێکیش خێڵی (بنو نضیر) - لە دوای دەرکردنیان لە مەدینە - کۆچی بۆ دەکەن، ژمارەی دانیشتوانی هێندەیکە زیاد دەکات.

بەو شێوەیە (خیبر) دەبێتە ناوچەیەکی بێ پیت و فەڕی جولەکە و بنکەیەکی بە قەڵا تەنراوی دانیشتوانی زۆر، هەندێك لە سەرۆکەکانی خێڵی

(بنو نضیر) لەوانەی، کە لە خەیبەردا جێگیر بوبون هەستان بە هان دان و پشتگیری کردنی تیرە و خێڵەکانی (احزاب) لە دژی موسڵمانان.

لە دوای ئەوەش پێغەمبەرﷺ پەیمانی (حدیبیە) لەگەڵ قورەیشدا دەبەستێت و دڵنیا دەبێت لە نەبونی مەترسیان، جولەکەی (خیبر) بەو پەیمانە نارەحەت دەبن، ئینجا دڵنیا دەبن، کە پێغەمبەرﷺ نایەڵێت ئەو هەڵوێستە دژایەتکاری و ناپاکەیان، بە بێ تۆڵە و سزادان، بەسەردا ڕاببورێ.

بەهۆی ناپاکییان بەرامبەر بە موسڵمانان و پێغەمبەرﷺ بە پێویستی دەزانێت سزایان بدات و تۆڵەیان لێبکاتەوە، ئەوە بو لە دوای گەڕانەوەیان لە (حدیبیە) پێغەمبەرﷺ دەستدەکات بە خۆسازدان بۆ غەزای (خیبر) لە مانگی (محرم) لە ساڵی حەوتەمی کۆچیدا، بە (١٦٠٠) هەزار و شەش سەد جەنگاوەرەوە کە (٢٠٠) دوو سەد سواریان لەگەڵدا دەبێت بۆیان دەردەچێت، کاتێك دەگاتە نزیك قەلاکانیان هەردوولا بە یەکدا دێن و شەڕ گەرم دەبێت، یەکێك لەوانەی ئالای موسڵمانان هەڵدەگرێت و لەسەر دەستی ئەو مەزنترین قەلایان دەگیرێت، (علی)ی کوڕی (ابوطالب) بو، لە پاش گرتنی قەلاکە جولەکەکان یەکە یەکە خۆیان دەدەن بە دەستەوە و ناوچەکە بە گشتی دەکەوێتە ژێر دەستەلاتی موسڵمانانەوە.

پێغەمبەرﷺ نیازی دەبێت جولەکەکان بە تەواوەتی لە ناوچەی خەیبەر دوور بخاتەوە و دەریان بکات، بەلام ئەوان داوا دەکەن، کە ڕێیان پێبدات تێیدا بمێننەوە و کشت و کاڵی تێدا بکەن، پاشان نیوەی بەرهەمەکەیان بدەن بە موسڵمانان، پێغەمبەریشﷺ داواکەیان پەسەند دەکات لەگەڵ ئەوەشدا گفتی ئەوەیان لێ وەردەگرێت، کە موسڵمانان مافی ئەوەیان هەبێت و لەهەر کاتێکیشدا بیانەوێت ئەوان دەربکەن، ئەوا ئەمان بە قسەیان بکەن و بە بێ شەڕ و ئاژاوە دەربچن.

بەو شێوەیە جولەکەکان لە خەیبەردا دەمێننەوە، تا سەردەمی (عمر)ی کوڕی (خطاب) ﷺ، ئینجا بەهۆی خراپەیانەوە دەریان دەکات و دووریان دەخاتەوە.

## وانەی شەشەم: رزگار کردنی مەککە

ڕێککەوتننامەی (حودەیبیە) ڕێککەوتنێکی زۆر سودمەند بو بۆ موسڵمانان، یەکێك لەو سودانەی ئەوە بو موسڵمانان بۆ ماوەیەك بێ خەم بون لە دەست درێژی شەڕەنگێزی قوڕەیش، هەروەها دەرفەتی ئەوەی بۆ ڕەخساندن، کە کاتەکانیان بۆ وەڵام دانەوە و بەرەنگار بونەوەی جولەکەکانی (خەیبەر) تەرخان بکەن، جگە لەوەش هەلی ئەوەی بۆ سازاندن، کە پەیامی ئیسلام بگەیەننە ئەو شوێنانەی، کە پێیان نەگەیشتبو، هەر ئەو سەرکەوتنانەش بونە هۆیەك بۆ بڕوا پەیدا کردنی ژمارەیەك لە قوڕەیش، بەوەی موسڵمانان لەسەر هەقن، پاشان باوەڕیان پێ هێنا و موسڵمان بون، لەوانە (خالد)ی کوڕی (ولید).

قورەیش بە ڕێککەوتننامەی (حدیبیە)وە پەیوەست نەبون و پەیمانەکەیان شکاند، ئەوە بو یارمەتی خێڵی (بکر)یان دا، تا بدەن بەسەر خێڵی (خزاعە)، کە لەگەڵ پێغەمبەرﷺ هاوپەیمان بون و پشتگیرییان لێدەکرد، ژمارەیەکیان لێ کوشتن.

لەبەرئەوە خێڵی (خزاعە) داوایان لە پێغەمبەرﷺ کرد، کە یارمەتییان بدات، لەو کاتەدا گەورە پیاوانی قوڕەیش هەستیان بە مەترسی کارەکە و لاری خۆیان کرد، هەربۆیە (ابو سفیان)ی سەرۆکیان ڕێی مەدینە دەگرێتە بەر و هەوڵ دەدات، کە پەیمانەکە زیندوو بکاتەوە، ماوەکەشی درێژ بکاتەوە، بەڵام هەوڵی (ابوسفیان) بە فیڕۆ دەڕوات، چونکە پێغەمبەرﷺ سور دەبێت لەسەر سزادانیان بەهۆی بێ گفتی و پەیمان شکێنیان، فەرمان بە موسڵمانان دەدات خۆیان بۆ غەزا ئامادە بکەن، لە ڕۆژی (١٠)ی رەمەزانی ساڵی هەشتەمی کۆچیدا پێغەمبەرﷺ بە (١٠) هەزار جەنگاوەرەوە بەرەو مەککە دەکەوێتە ڕێ، لە

نیوەی ڕێگا (عباس)ی کوڕی (عبدالمطلب) مامی بە خۆی و ماڵ و منداڵییەوە پێی دەگات، کە موسڵمانان لە مەککە نزیك دەکەونەوە پێغەمبەرﷺ فەرمانیان دەداتێ دابەزن و ئاگرێکی گەورە بکەنەوە، بۆ ئەوەی بەوە هێز و توانایان بۆ دوژمنان دەربخەن، موسڵمانان فەرمانەکەی بەجێ دێنن، بەوە قوڕەیش مەترسیان لە ژیانی خۆیان بۆ دروستدەبێت، هەرلەبەرئەوەش (ابوسفیان) خۆی بۆ مەبەستی هەواڵ زانین و پشکنینی بارودۆخەکە لە مەککە دەچێتە دەرەوە، لە ڕێگادا (عباس)ی کوڕی (عبدالمطلب)ی توش دەبێ، (عباس) پێی دەڵێت: (موسڵمانان زۆر بەهێز بونە و سوپاکەیان گەورەیە، جا من دڵنیام قوڕەیش خۆی لەبەر هێرشی موسڵماناندا ناگرێت).

(ابوسفیان) بڕوا بە قسەکەی (عباس) دەکات، پاشان (عباس) دەیبات بۆ لای پێغەمبەرﷺ تا بڕیار لەسەر بێ مەترسی ژیانی بدات و دڵنیای بکات، کە کەس بە گژیدا ناچێت، کاتێك دەچێتە خزمەتی پێغەمبەری ئازیزﷺ باسی بڕوا هێنان و موسڵمان بونی بۆ دەکات، (عباس)یش دەڵێت: ئەی پێغەمبەری خوا (ابوسفیان) پیاوێکە حەزی لە ناوبانگە و دەیەوێت ئەو ڕێز و شوێنەی، کە هەیەتی لە ناو خەڵکیدا بمێنێتەوە، لەبەرئەوە کارێکی وەهای لەگەڵدا بکە، کە دڵی پێی خۆش بێت. پێغەمبەرﷺ دەفەرموێت:

(هەر کەسێك بچێتە ماڵی (ابوسفیان)ەوە ئاسودە بێ، ئەوەش لە ماڵی خۆیدا بمێنێتەوە و دەرگا دابخات، ئەویش ئاسودەبێ، هەر کەسێکیش بچێتە (کعبە)ی پیرۆزەوە ئەوە ئەویش لە ژیانی بێ خەم بێت)، پاشان داوا لە (عباس) دەکات (ابوسفیان) لە شوێنێکی وا بوەستێنێت، کە لە کاتی تێپەڕ بونی سوپای موسڵماناندا چاوی بە تەواوی سوپاکە بکەوێت، بەوە (ابوسفیان) توانا و هێزی موسڵمانانی بە تەواوەتی بۆ دەردەکەوێت.

ئینجا (ابوسفیان) دەچێتەوە بۆ مەککە و حاڵەکە بۆ خەڵکی ڕوندەکاتەوە و پێیان ڕادەگەیەنێت، کە پێغەمبەرﷺ باسی لە بێ مەترسی هەندێك شوێن کردوە و شوێنەکانیشیان پێ دەڵێت:

دوای ئــەوە پێغەمبــەرﷺ پێشــەوایەتی ســوپاکە دەکـات و بــە دەم ســوپاس گوزاری خوای گەورەوە، کە سەری خستن بەسەر بێ بڕوایاندا خۆیان دەکەن بە مەککەدا، پێغەمبــەرﷺ فــەرمان دەدات، کــە کــەس لــە ســوپاکەی دەســتدرێژی نەکاتە سەر هیچ کەسێك، مەگەر کەسێك خۆی نیـازی دژایـەتی و شـەڕ کردنـی هەبێت، پێغەمبەرﷺ خۆی لەلای باکورییەوە دەچێتە ناو مەککەوە و فـەرمان بە (خالد)ی کوڕی (ولید) دەدات، کە ئـەمیش لـە باشـورییەوە بچێتە ژوورەوە، بەو جۆرەش ئامۆژگاری دەکات، گەر هەر کەسێك هاتە ڕێـی و بـەرەنگاری کـرد، ئەوجا دەستی لێ بوەشێنێت، (خالد)یش فەرمانەکە بەجێ دێنێت.

بەو شێوەیە لە بەرواری (٢٠)ی ڕەمەزاندا قوڕەیش خۆی دەدات بە دەستەوە و خوای گەورە و کردگاری بالاّ دەستیش موسڵمانان سەر دەخات.

کاتێك موسڵمانان دەچنە ناو مەککەوە کە لە پێشانەوە پێغەمبەرﷺ دەبێت یەکسەر بەرەو ڕوی (مسجد الحرام) دەڕۆن و بە دەوری (کعبـە)دا دەسـوڕێنەوە، ئینجا دەچێتە ژوورەوە و نوێژی تێدا دەکات، پاشان تەواوی بتەکان دەشـکێنێت و ئەم ئایەتە دەڵێتەوە: ﴿ وَقُلْ جَآءَ ٱلْحَقُّ وَزَهَقَ ٱلْبَـٰطِلُ ۚ إِنَّ ٱلْبَـٰطِلَ كَانَ زَهُوقًا ﴾[١]..

دوای ئەوە لەبەر دەرگای (کعبە)دا دەوەستێت، لەو کاتەدا کۆمەڵێکی زۆر لـە قوڕەیشی بە چەند ڕیزێـك لـە مزگەوتەکەدا وەسـتا بـون پێغەمبـەرﷺ ڕویـان تێدەکات پێیان دەفەرموێت: (لا اله الا الله وحده لا شريك له).

واتە: (جگە لە ـ الله ـ هـیچ پەرسـتراوێك شـایەنی پەرسـتن نیـە، هـەر خـۆی تاك و بێ هاوەڵ و تەنهایە)، وا خوای گەورە گفـتی خـۆی بەرامبـەر موسـڵمانان بەجێ هێنا و بەنـدەکانی خـۆی سەرخست، هـەروەها ڕێـزی لـە سـەربازانی نـاو هەر خۆی شکستی بە (احـزاب) هێنـا، پاشـان فـەرموی: (ئـەی خـەڵکی قـوڕەیش

---

١ـ الإسراء:٨١.

چاوەڕوانن چیتان بەرامبەر بکەم؟ ئەوانیش گوتیان (هەمو خێرێك، چونکە تۆ هەمیشە برایەکی خانەدان و لێبوردە و ڕێزدار بویت و برازایەکی ڕێزداریت).

پێغەمبەرﷺ فەرموی: (أذهبوا فأنتم الطلقاء: بڕۆن ئێوە ئازاد و سەربەست بن).[١]

بەو شێوەیە مەککە ڕزگار کرا و لە بت پاککرایەوە، پێغەمبەرﷺ جوانترین نمونەی بەندایەتی و سوپاس گوزاری مرۆڤی بۆ خوای پەروەردگار نواند، هەروەها بوە پیاوی بەخشندە و لێبوردە لە کاتی توانا و دەسەڵاتدا، دوای ئەوە خەڵکی مەککە دەستە دەستە دەبونە موسڵمان و پۆل پۆل بڕوایان بە بەرزە پەیامی ژیان و قورئانی پیرۆز هێنا.

## وانەی حەوتەم: هەردوو غەزای ( حونەین ) و ( طائف )

کاتێك مەککە ڕزگار دەکرێت، هەردوو تیرەی (هوازن) و (ثقیف) ـ کە نیشتەجێی شاری طائف بون ـ ترسیان لێ نیشت، لەبەرئەوە سەرۆکەکایان وای بە باش دەزانێ، کە پێش ئەوەی ئەو شتە ڕو بدات، ئەمان هێرش بکەنە سەر موسڵمانان، ئەوە بو بە سەرۆکایەتی (مالك)ی (عوف) سوپایەکی گەورەیان پێك هێنا و ژن و ماڵ و ماڵەکانیشیان پێش خۆیاندا، تا پشتگیریان لێبکەن و هاندەریان بن لە شەڕدا.

کە پێغەمبەرﷺ بەوە دەزانێت، لە ڕۆژانی یەکەمی مانگی (شوال)دا دەردەچێت بۆ بەرەنگار بونەوەیان، لەگەڵ خۆیدا (دوانزە هەزار جەنگاوەر) دەبات (١٠ هەزاریان) لەوانە دەبن، کە بە هۆیانەوە مەککە ڕزگار کراوە (٢ هەزاریشیان) لە خەڵکی مەککە دەبن و ئەوانەش، کە لە دوای ڕزگار کردنەکەی

---

[١] رواه ابن اسحاق في ((السيرة)) (٤/٣١-٣٢) وعنه الطبري في ((التأريخ)) (٣/١٢٠)، ضعيف ضعفه الألباني في سلسلة الأحاديث الضعيفة.

موسڵمان بون، گەورەیی سوپاکە و زۆری ژمارەیان وا لە جەنگاوەران دەکات، کە زیاتر باوەڕیان بە خۆیان هەبێت و بە جەرگتر بن.

شەڕکەرانی (هوازن) و (ثقیف) دەگەنە دۆڵی (حنین) و بە هەردوو لای دۆڵەکەدا دابەش دەبن و بۆسە بۆ موسڵمانان دەنێنەوە.

لە بەرەبەیاندا موسڵمانان دەگەنە تەگەی دۆڵەکە لەو کاتەدا دوژمنانیان ڕێژنە تیرێك دەبارێننە سەریان و هەمو بە یەك دەست و وەك یەك پیاو دەدەن بەسەریاندا، ئەوانیش هەڵدێن و مەیدانەکە، جگە لە پێغەمبەرﷺ و ژمارەیەك لە هاوەڵانی کە ئەوانیش (ابوبکر و عمر و علی و عباس) دەبن کەسی تێدا نامێنێت، جا بۆ گێڕانەوەیان پێغەمبەرﷺ هاواریان لێدەکات و دەفەرموێت: (ئەی خەڵکینە وەرنەوە....من پێغەمبەرە بە حەق نێرراوەکەتانم...من کوڕەکەی (عبدالمطلب)م).

پاشان فەرمان بە (عباس) ـ کە دەنگی بەرز دەبێت ـ دەدات بانگ بکات و بڵێت (ئەی پشتیوانان (أنصار) ئەی کۆچکردوان ـ مهاجرین ..ئەی خاوەنانی بەڵێنی ژێر درەختەکە...بگەڕێنەوە...).

موسڵمانان کە گوێیان لە بانگەوازەکە دەبێت، بە دەنگ بانگەوازەکە دەچن و دەڵێن: قوربانتین...قوربانتین...ئینجا هەمو بە دڵ گەرمی و جۆشێکی باوەڕدارانەوە دەگەڕێنەوە و لەگەڵ دوژمناندا دەجەنگین، خوای گەورەش شکستەکەیان بۆ دەگۆڕێت بەسەرکەوتنێکی گەورە، فریشتە دادەبەزێنێ بۆ یارمەتی ئیمانداران، بەو شێوەیە ئەو شەڕە وانەیەکی پڕ سود دەبێت بۆ موسڵمانان، خوای گەورەش ئاماژە بۆ ئەوە دەکات و دەفەرموێت:

(لَقَدْ نَصَرَكُمُ ٱللَّهُ فِى مَوَاطِنَ كَثِيرَةٍۙ وَيَوْمَ حُنَيْنٍۙ إِذْ أَعْجَبَتْكُمْ كَثْرَتُكُمْ فَلَمْ تُغْنِ عَنكُمْ شَيْـًٔا وَضَاقَتْ عَلَيْكُمُ ٱلْأَرْضُ بِمَا رَحُبَتْ ثُمَّ

وَلَّيْتُم مُّدْبِرِينَ ﴿٢٥﴾ ثُمَّ أَنزَلَ ٱللَّهُ سَكِينَتَهُۥ عَلَىٰ رَسُولِهِۦ وَعَلَى ٱلْمُؤْمِنِينَ وَأَنزَلَ جُنُودًا لَّمْ تَرَوْهَا وَعَذَّبَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ ۚ وَذَٰلِكَ جَزَآءُ ٱلْكَـٰفِرِينَ )[١]..

واتە: بێ گومان خوای گەورە لە زۆر شوێندا سەرکەوتنی پێ بەخشین، ڕۆژی حونەینیش کاتێك سەرسام بون لە زۆری خۆتان، ئەو زۆرییەتان فریاتان نەکەوت، پشتتان وەرگێڕا و هەڵاتن، بەڵام لەوە بە دواوە خوای گەورە ئارامی دابەزاندە سەر پێغەمبەرەکەی و سەر ئیمانداران، سەربازانێکی دابەزاند کە ئێوە نەتان دەدیتن، سزای بێ باوەڕانیدا، هەر بەو شێوەیە تۆڵەی سەند لە بێباوەڕدان.

لە دوای ئەوە موسڵمانان سەرکەوتن بە دەست دێنن، پێغەمبەرﷺ ژن و منداڵ و دەسکەوتەکەیان لە شوێنێکی بێ مەترسی و لە ژێر چاودێریدا دادەنێت و بە ژمارەیەك لە جەنگاوەرانەوە شوێنی هەڵاتوان دەکەون و شوێن پێیان هەڵدەگرن و بەرەو (طائف) دەچن و لەوێ بۆ ماوەی (٢٠) ڕۆژ گەمارۆیان دەدەن، بەڵام بەهۆی ئەو خۆ قایم کردنەوە و بەرگری شەڕکەران موسڵمانان ناتوانن ناوچەکە رزگار بکەن.

پێغەمبەرﷺ بەجێیان دەهێڵێت و دڵنیاش دەبێت لەوەی، کە ڕۆژێك لە ڕۆژان خەڵکی ئەو ناوچەیە بڕوا دەهێنن و دێنە ریزی موسڵمانانەوە.

پێغەمبەرﷺو موسڵمانان دەگەنەوە ئەو شوێنەی، کە ژن و ماڵ و منداڵ و سامانەکەی تێدا جێ هێڵا بو، ژمارەی ژن و منداڵەکان (شەش هەزار) کەس دەبن و دەسکەوت و ماڵەکەش (بیست هەزار وشتر) و (چل هەزار مەڕ) دەبن.

لەو کاتەدا نوێنەرێکی (هوازن) دێنە لای پێغەمبەرﷺ موسڵمان بونی خۆیان ڕادەگەیەنن، تکای ئەوە دەکەن ماڵ و منداڵەکانیان بۆ بگێڕێتەوە.

پێغەمبەرﷺلە نێوان هەڵبژاردنی وەرگرتنەوەی ژن و منداڵ و سامانەکەیاندا سەرپشکیان دەکات، ئەوانیش ژن و منداڵەکان هەڵدەبژێرن،

---

١ـ التوبة/٢٥_٢٦.

پاشان پێغەمبەرﷺ فەرمانیان پێ دەدات دوای نوێژی نیوەڕۆ بێن و داوا لەو بکەن، کە لای موسڵمانانیان شەفاعەتیان بۆ بکات، بۆ لێخۆش بونیان لە شتەکانیان، هەروەها داوا لە موسڵمانان بکەن، تا ببنە شەفاعەتکاریان لای پێغەمبەرﷺ، نوێنەرەکە بەمە ڕازی دەبن و فەرمانەکەی بەجێ دێنن.

لە بەرامبەردا پێغەمبەرﷺ دەفەرموێت: (ئەوەی بەشی من و بەر من دەکەوێت، هەروەها ئەوەشی بەشی نەوەکانی (عبدالمطلب)ە، ئەوا بۆ ئێوە).

کۆچکردوان (مهاجرین) و پشتیوانان (انصار)یش دەڵێن: (ئەوەش بەشی ئێمە پێشکەشی دەکەین بە پێغەمبەری خوا).

لە کۆتاییدا ژن و منداڵەکان دەگەڕێنرێتەوە بۆ نوێنەرەکە و پێغەمبەرﷺ پێیان دەفەرموێت: بە (مالك)ی کوڕی (عوف)ی سەرۆکتان ڕابگەیەنن، کە گەر بە موسڵمان بونی بێتە لام، ئەوا ژن و منداڵ و ماڵەکەی خۆی دەدەمەوە، سەرەڕای ئەو (سەد حوشتریشی بە خەڵات دەدەمێ).

کاتێك نوێنەرەکە دەگەڕێتەوە بۆ (طائف) و ڕاسپاردەکە بە (مالك) ڕادەگەیەنن، (مالك) خۆی دەگەیەنێتە لای پێغەمبەرﷺ، ئەویش گفتەکەی بەجێ دەهێنێت.

پێغەمبەرﷺ وا بە باش دەزانێت، کە دڵی ئەو کەسانەی، کە تازە موسڵمان بون خۆشبکات و بەو خەڵاتانەی کە لە دەستکەوتەکانی (حنین) بون، ئەوە بو هەندێکیان (١٠٠) وشتر و هەندێکی دیکە (٥٠) وشتری دا، لە نێو ئەو کەسانەدا کە خەڵاتیان پێ بەخشرا بو، کەسێکی پشتیوانان ـ انصاری ـ تێدا نەبو، ئەو مەسەلەیەش کار لە پشتیوانان دەکات، وەك گلییەك لە دڵی دەگرن، کاتێك پێغەمبەرﷺ بەمە دەزانێت کۆیان دەکاتەوە و وتارێکی زۆر کاریگەریان بۆ دەبێژێت، هۆی بەخشینی خەڵاتەکەش بۆ پشتیوانان ڕون دەکاتەوە، ئینجا پێیان دەفەرموێت: (بەوە ڕازی نین، کە خەڵکی بە وشتر و ماڵاتەوە بگەڕێنەوە و ئێوە بە پێغەمبەری خواوە بگەڕێنەوە؟ سوێند بەوەی ڕۆحی (محمد)ی بە دەستە، گەر کۆچ نەبوایە، من پیاوێك دەبوم لە پشتیوانان (انصار)، ئەگەر

هەمو خەڵکی لە دۆڵێکدا بڕۆیشتنایە و پشتیوانان بە دۆڵێکی دی بڕۆیشتنایە ئەوا من لەگەڵ پشتیوانان‌دا دەبوم، خوای گەورەش لە پشتیوانان و ڕۆڵەی پشتیوانان و ڕۆڵەی ڕۆڵەشیان خۆش بێت و بیانبەخشێ) وتەکانی زۆر کاریگەر دەبێت لە پشتیوانان و دەیانخاتە گریان، پاشان دەڵێن: (پێغەمبەری خوا رازین کە ببێتە بەش و نەسیبمان).

دوای ئەوە پێغەمبەرﷺ ئەوانەی لەگەڵیدا دەبن دەگەڕێنەوە بۆ مەککە و (عمرە) بەجێ دێنن، ئینجا دوای ئەوەی خوای گەورە بە پاك کردنەوە و ڕزگارکردنی ئەو شوێنانەی ڕێزیان لێدەنێت، دەگەڕێنەوە بۆ (مەدینە).

## وانەی هەشتەم:

﴿ٱلۡيَوۡمَ أَكۡمَلۡتُ لَكُمۡ دِينَكُمۡ﴾ المائدة/٣

## حەجی ماڵئاوایی:

پێغەمبەرﷺ لە ساڵی حەوتەمی کۆچیدا و پێش ڕزگارکردنی مەککە (عمرة) بەجێ دەهێنێت، هەروەها دوای ڕزگار کردنی مەککەش واتە لە ساڵی هەشتەمدا (عمرة) دەکات، لە ساڵی نۆیەمیشدا (ابوبکر) لەگەڵ حاجییاندا دەنێرێت، تا ببێتە (أمیر)یان. لەو کاتەدا سورەتی (براءة)ی بۆ دێتە خوارەوە، هەربۆیە پێغەمبەرﷺ بە پەلە (علی)ی کوڕی (ابوطالب) دەنێرێتە لای (ابوبکر) بۆ ئەوەی ئەو سورەتەی (براءة)یان بۆ بخوێنێت لە مەککەدا و بە خەڵکی ڕابگەیەنێت، کە لەم ساڵ بە دواوە، چیدی نابێت هاوەڵگەڕان و بێ بڕوایان حەجی ماڵی خوا بکەن.

کە مانگی (ذي القعدة)ی ساڵی دەیەم دێت، پێغەمبەرﷺ دەستدەکات بە خۆسازدان بۆ حەج کردن، بۆ ئەوەی بە تەواوی شێوەی حەج کردنیان بۆ ڕونبکاتەوە و بە شێوەیەکی گشتی یاسا و بنەماکانی ئیسلامیان بۆ شیتەڵ بکات.

موسڵمانان بە گەرمییەوە بە دەم فەرمانەکەیەوە دەچن، لە ئاکامدا ژمارەی ئەوانەی حەج دەکەن لە خزمەتیدا لە (سەد هەزار) موسڵمان پتر دەبێت، بەو شێوەیە بەشەکانی حەجیان بە وتە و کردارەوە فێر دەکات، پاشان لە ناوچەی (منی) وتارێکی زۆر گرنگیان بۆ دەخوێنێ، کە تێیدا هاتوە:

(ئەی خەڵکینە! گوێ بۆ وتەکانم شل بکەن، دوور نییە ساڵێکی تر نەتوانم پێتان بگەمەوە...

ئەی خەڵکینە! خوێن و ماڵ و شەرەفتان لە خۆتان حەرامە، تا ئەو کاتەی بە خوای خۆتان دەگەن...

ئەی خەڵکینە! خوای هەموتان یەکە، باوکی هەموشتان هەر یەکە، هەموتان لە ئادەم کەوتونەتەوە، ئادەمیش لە خۆڵ دروستکراوە، بەڕێزترین و پایەدارترینشتان لای خوا ئەوەتانە، کە کاری چاکەی زۆرە، هیچ کاتێک عەرەبێك لای خوا لە یەکێکی دی باشتر نییە، مەگەر بەهۆی کاری چاکەوە نەبێت).

لەگەڵ وتنی هەریەك لەو بڕگانەدا دەیفەرمو:

(ألا هل بلغت؟ اللهم فاشهد).

واتە: (ئاگادار بن ئایا پێم گەیاندن؟ خوایە خۆت بە شاهێد بە).

هەر لەم ڕۆژەدا ئەم ئایەتە پیرۆزەی بۆ دێتە خوارەوە:

(ٱلۡيَوۡمَ أَكۡمَلۡتُ لَكُمۡ دِينَكُمۡ وَأَتۡمَمۡتُ عَلَيۡكُمۡ نِعۡمَتِي وَرَضِيتُ لَكُمُ ٱلۡإِسۡلَٰمَ دِينٗاۚ )[١].

واتە: (ئەمڕۆ من ئاینەکەتانم بۆ تەواوکردن و نازونیعمەتی خۆمم بە تەواوی پێ بەخشین و ڕازیم، کە ئیسلام ببێتە بەرنامەتان).

لەبەرئەوە ئەو حەجە دوا حەجی پێغەمبەری خوا دەبێت، بە حەجی ماڵ ئاوایی ناو دەنرێت.

---

١ـ المائدة/٣.

## کۆچی دوایی پێغەمبەرﷺ:

لە دوای ئەوەی پێغەمبەرﷺ حەجەکەی تەواو دەکات، دەگەڕێتەوە بۆ مەدینە، پاشماوەیەکی کەم بە گەیشتنەوەی مەدینە، فەرمان دەدات، کە سوپایەکی گەورە بۆ رزگار کردنی ولاتی شام ئامادە بکرێت، بۆ سەرۆکایەتی سوپاکە (أسامة)ی کوڕی (زید) هەڵدەبژێرێت، کە لەو کاتەدا تەمەنی (بیست ساڵ) زیاتر نابێت.

بەلام ئەو سوپایە زۆر لە مەدینە دوورناکەوێتەوە، لە کۆتایی مانگی سەفەری ساڵی یازدەی کۆچیدا، پێغەمبەرﷺ نەخۆشی لێ دەردەکەوێت، ڕۆژ لە دوای ڕۆژ نەخۆشییەکەی زیاد دەکات، لەو کاتەدا کە ئیدی توانای بەرنوێژی (إمامەتی) نامێنێت، فەرمان بە (ابوبکر) دەدات، کە بەرنوێژیان بۆ بکات، لە بەرەبەیانی ڕۆژی دووشەممەی مانگی (ربیع الأول)دا پێغەمبەری ئازیزمان ئەم دنیایە بەجێ دەهێڵێت و کۆچ دەکات بۆ لای خوای گەورە، (هەزارەها درووودو سلاوی خوای گەورە و بالادەستی لەسەر بێت).

بەو شێوەیە ژیانی پێغەمبەرﷺ لەم دونیایەدا کۆتایی پێدێت، ئەو مەزنە مرۆڤەی هەردەم بە لێبڕاوییەوە پەیامی خوای گەیاند، بە ئەمەك و دڵسۆزییەوە ڕاسپاردە خواییەکانی بە خەڵکی دەگەیاند، ڕێنومایی میللەتی دەکرد و لە پێناو خوادا بە باشترین شێوە جیهادی دەکرد.

هەربۆیە خوای گەورەش بە باشترین شێوە پاداشتی دەداتەوە، گەلی موسڵمانیش بەوە ڕێزدار دەکات، کە دەیانکاتە شوێن کەوتەی پێغەمبەرێکی ئاوەها.

کاتێ موسڵمانان بە کۆچی دوایی پێغەمبەرﷺ دەزانن، زۆر غەمبار دەبن و هەندێکیشیان ترسیان لێ دەنیشێت، هەر بۆیە (ابوبکر)ﷺ، دەچێتە لایان و وتارێکیان بۆ دەخوێنێ و پێیان دەڵێت: (ئەی خەڵکینە...ئەوی محمەدی دەپەرست، ئەوا محمد مرد، ئەوەشی خوا دەپەرستێت، ئەوا خوای گەورە هەمیشە زیندوە و نامرێت).

پاشان ئـەم ئایەتـە پـیرۆزەی خوێنـدوە: ﴿ وَمَا مُحَمَّدٌ إِلَّا رَسُولٌ قَدْ خَلَتْ مِن قَبْلِهِ الرُّسُلُ ۚ أَفَإِيْن مَّاتَ أَوْ قُتِلَ انقَلَبْتُمْ عَلَىٰٓ أَعْقَٰبِكُمْ ۚ وَمَن يَنقَلِبْ عَلَىٰ عَقِبَيْهِ فَلَن يَضُرَّ اللَّهَ شَيْـًٔا ۗ وَسَيَجْزِى اللَّهُ الشَّٰكِرِينَ ﴾ آل عمران/١٤٤.

وتەکانی (ابوبکر)ﷺ، خەڵکەکە هێور و هێمن دەکاتـەوە، دوای تـەواوبونی وتارەکە، خەڵکەکەش بڵاو دەبنەوە و بە دەم ڕۆیشتنەوە ئەمە دەڵێنەوە:

(انا لله وإنا اليه راجعون).

لە پاش شۆردن و کفنکردنی پێغەمبەری ئازیز و پێشـەوامانﷺ موسـڵمانان پۆل پۆل دەچنە سەر تەرمە پیرۆزەکەی، ئەوجا نوێژی لەسەر دەکەن، کە نوێژ تەواو دەبێت، هەر لەو شوێنەدا، کە گیانی پاك و پیرۆزی تێدا دەردەچێت، کـە ماڵی (عائشە)ی دایکی موسڵمانانە، ڕەزا و ڕەحمـەتی خـوای لەسـەر بێـت، هـەر لەوێدا دەینێژن، کە ڕێکەوتی نیوەشەوی چوارشەممە دەکات.

# بەشی ( ١١ )

# فەرمودەکانی پێغەمبەرﷺ

(بۆ لەبەرکردن)

﴿ئەمەش بریتییە لە (٤٢) فەرمودە بە ماناکەیەوە﴾

١- ان أبي مسعود - عقبة بن عمرو الانصاريرضي الله عنه قال: قال النبيﷺ إن مما أدرك الناس من كلام النبوة الأولى اذا لم تستح فاصنع ما شئت.

رواه البخاري كتاب الادب/رقم/١٩٥١

واتە: لەو قسە نەستەق و بەجێ و پڕ مانایانەی کە لە پێغەمبەرانەوە بۆ خەڵکی ماوەتەوە ئەوەیە کە فەرمویانە: ئەگەر شەرمت نەبو هەرچییەکت دەوێ بیکە.

واتە پیاو کە شەرم و حەیای نەبو، ئەوەی بە خەیاڵی دابێت دەیکات و لە قسە و کردەوەی خراپ و پەیمانی درۆ و فڕ و فێڵ و خیانەت و...هتد. بە کورتی هەر چیەك بە خەیاڵیدا بێت بانگەوازی لەگەڵ مرۆڤایەتی و ئاین و ڕەوشتی بەرزدا نەگونجێت هەر دەیکات.

٢- عن كعب بن مالكرضي الله عنه ان رسول اللهﷺ قال: ما ذئبان جائعان ارسلا في غنم بأفسد لها من حرص المرء على المال والشرف لدينه.

صحيح رواه احمد في مسنده والترمذي.

واتە: دوو گورگی برسی ئەگەر بەر درێتە ناو ڕانە مەڕێك (مێگەلێك) لەوە زیاتر زیانی پێناگەیەنن، کە حەز و سوربونی کەسێك لەسەر ماڵ و پلە وپایەی دونیایی دەیگەیەنن بە دینی ئەو کەسە.

واتە: ئەوەندەی حەز و سوربون لەسەر سەروەت و سامان و پلە وپایەی دونیایی زەرەر و زیان دەگەیەنێت بە دینی مرۆڤ، دوو گۆرگی برسی ئەوەندە زەرەر و زیان ناگەیەنن لە ڕانە مەڕێك، ئەگەر تێی بەربن و بکەونە ناوی.

واتە: دوو گورگی برسی چی دەکەن بە ڕانە مەڕێك، سوربون لەسەر ماڵ و پلە وپایە لەوە زیاتر دەکەن بە دینی موسڵمان، ئەگەر سوربون لەسەر ماڵ و ناوو شوهرەت و پلە وپایە ئەوەندە زەرەر بگەیەنێت بە مرۆڤی دیندار، کە زۆر جار ترسی خوا و دوارۆژ لە دڵ دایە، دەبێ چەندە زەرەر بدات لە کەسانی بێ دین، کە جگە لە پلە وپایە و سەروەت و سامان هیچ مەبەستێکی دیکەیان نییە.

٣ـ عن أم المؤمنين أم عبدالله عائشة (رضي الله عنها) قالت: قال رسول اللهﷺ من أحدث في أمرنا هذا ما ليس منه فهو ردّ.

رواه البخاري و مسلم.

واتە: هەر کەسێك شتێکی داهێنا لەو دینەی، کە ئێمە هێناومانە و ئەو شتە لە دینەکەدا نەبێت ئەوا بێ گومان شتەکە ڕەتدەکرێتەوە و کاری پێ ناکرێت.

واتە: هەر یەکێك شتێکی وای لە ئیسلامدا داهێنا، کە هیچ بەڵگەیەکی لە قورئان و سوننەتی پێغەمبەرﷺ لەسەر نەبو، ئەوا بەسەر خاوەن و داهێنەرەکەیدا دەدرێتەوە و لێی قەبوڵ ناکرێ، چونکە خوای کاربەجێ دینەکەی تەواوو کامڵ کردوە و فەرمانی بە هەمو ئەو شتانە کردوە، کە قازانج و خێری بەندەکانی تێدایەوە نەهی لە هەمو ئەو شتانە کردوە، کە زیان و خراپەی هەیە بۆیان.

بۆیە هەریەکێ لە خۆیەوە شتێك بۆ ناو دینەکەی بێنێ کە هیچ بەڵگەیەکی شەرعی لەسەر نەبێ ئەوا شتەکە بە بیدعە و شتێکی لە خۆڕا داهێنراو دەژمێررێ، کە پێغەمبەرﷺ بە گومڕایی (ضلالة) ناوی دەبات.

٤ ـ عن أبي هريرةرضي الله عنه ان رسول اللهﷺ قال: أتدرون ما الغيبة؟ قالو: الله و رسوله أعلم، قال ذكرك أخاك بما يكره، قيل أفرأيت إن كان في اخي ما أقول، قال: ان كان فيه ما تقول فقد أغتبته وإن لم يكن فيه ما تقول فقد بهته.

رواه مسلم.

واتە: (ئایا دەزانی غەیبەت چیە؟ خەڵکەکە گوتیان: خوا و پێغەمبەرەکەی زاناترە.. فەرموی: باس کردنی براکەتە بە شتێك پێی ناخۆش بێت، عەرزیان کرد، ئەدی ئەگەر ئەو شتەی من دەیڵێم لە براکەمدا هەبو هەر بە غەیبەت دەژمێردرێت؟

فەرموی: ئەگەر بەو جۆرە بێ کە تۆ باسی دەکەیت ئەوە غەیبەتت کردوە، ئەگەر بەو شێوەیەش نەبو کە تۆ باسی دەکەی، ئەوە بێ گومان بوختانت پێ کردوە).

ئیمامی نەوەوی دەفەرموێت: (غەیبەت ئەوەیە باسی کەسێك بکەی بە شتێك پێی ناخۆش بێت، جا ئەو شتە لە لەش و جەستەیدا بێ، یان لە دینیدا بێ، یا لە دونیایدا بێ، یا لە دەروون ـ نفس ـ دا بێ، یان لە ڕەوشتیدا بێت، یان لە ڕەنگ و ڕواڵەت، یا لە ماڵ و منداڵ و باوك و هاوسەر و خزمەتکار و پۆشاك و جل و بەرگ و ڕۆیشتن و ڕو خۆشی و ڕوگرژیدا بێ، یان لەهەر شتێکی تر، کە پەیوەندی پێوەی هەبێ، جا ئەو باسکردنە بە قسە بێ یان بە ئیشارە و ئاماژە بێ، یان بە هێما بێ، یان بە نوسین بێ، ئەمانە هەموی بە غەیبەت دەژمێردرێن). فتح الباري/١٠/٣٨٥,

٥ ـ عن ابن مسعودﷺ قال: خط لنا رسول اللهﷺ خطاً بيده ثم قال: (هذا سبيل الله مستقيماً، وخط خطوطاً عن يمينه و شماله، ثم قال: هذه السبل ليس منها سبيل الا عليه شيطان يدعو اليه ثم قرأ قوله تعالى: (وَأَنَّ هَذَا صِرَاطِي مُسْتَقِيمًا فَاتَّبِعُوهُ وَلاَ تَتَّبِعُوا السُّبُلَ فَتَفَرَّقَ بِكُمْ عَنْ سَبِيلِهِ ذَلِكُمْ وَصَّاكُمْ بِهِ لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ). صحيح رواه احمد والنسائي.

واتە: پێغەمبەرﷺ خەتێکی ڕاستی لەسەر زەوی کێشا بە دەستی موبارەکی، پاشان فەرموی: ڕێی خوا وەکو ئەم خەتە ڕاستە وایە، ئینجا چەند خەتێکی دیکەی لەم لاو ئەو لای ڕاست و چەپی خەتە ڕاستەکە کێشا، پاشان فەرموی: ئەمانەش ڕێ و ڕێبازی غەیری ڕێبازی خوان، هەر ڕێگەیەکیش لەم ڕێگایانە

شەیتانێکی لەسەرەو خەڵکی بۆ بانگدەکات.

پاشان ئەم ئایەتەی خوێندەوە، کە واتاکەی بەم جۆرەیە:

(ئەم ئیسلامە رێگەی ڕاستی منە و شوێنی ئەم رێگەیە بکەون و بە شوێن تولە رێ و رێچکەکان مەکەون، تا لە ڕێگەی ئیسلام دەربەدەر نەبن، ئەمە فەرمان و وەسیەتی خوایە بۆ ئێوە و ئێوەش لە خوا بترسن و خۆتان بپارێزن لە بێ فەرمانی کردنی).

٦ـ عن سعيد بن ابي بردة عن ابيه عن جده عن النبيﷺ قال: على كل مسلم صدقة قالوا يا نبي الله فمن لم يجد قال يعمل بيده فينفع نفسه و يتصدق قالوا فان لم يجد قال: يعين ذا الحاجة الملهوف قالوا فان لم يجد قال: فليعمل بالمعروف وليمسك عن الشر فانها له صدقة.

رواه البخاري/ فتح الباري ج٣ص٢٣٩.

واتە: هەمو موسڵمانێك لەسەریەتی خێرێك بكات گوتیان: ئەگەر نەیبو، فەرموی: كاری دەستی دەكات، ئەو كاتە سودی بۆ خۆی دەبێت و خێریشی لێدەكات، گوتیان: ئەگەر دەستی نەكەوت، فەرموی: یارمەتی پێ گیراوان و خاوەن پێویستییەكان بدات، گوتیان: ئەگەر نەیتوانی فەرموی: كار بە چاكە بكات و خۆی لە خراپە بگرێتەوە چونكە بێگومان ئەمەش بۆی هەر خێر و سەدەقەیە.

٧ـ عن أنسؓ عن النبيﷺ قال: ثلاث من كن فيه وجد حلاوة الايمان: ان يكون الله ورسوله أحب اليه مما سواهما، وأن يحب المرء لا يحبه إلا لله، وأن يكره أن يعود في الكفر كما يكره ان يقذف في النار.

رواه البخاري/باب الايمان في صحيحه/رقم١٦ ومسلم رقم ٤٣.

واتە: سێ شت هەن، هەر كەسێك ئەو سێ شتانەی تێدا بەدی بكرێن ئەوە بە ڕاستی تام و چێژ و شیرینی ئیمانی كردوە:

١. کە خوا و پێغەمبەری خوای بە لاوە خۆشەویستر بێ لە هەمو شتێکی دی.

٢. هەر کەسێکی خۆش دەوێت لەبەر خۆشەویستی خوا بێت.

٣. پێی ناخۆش بێت، کە لە ئیسلامەوە بگەڕێتەوە ناو کوفر، هەروەکو پێی ناخۆش دەبێت، کە فڕێ بدرێتە ناو ئاگرەوە.

٨. عن أنس رضي الله عنه قال: قال رسول الله ﷺ إن من أشراط الساعة أن يرفع العلم و يثبت الجهل و يشرب الخمر و يظهر الزنا.

البخاري/رقم ٧٠/باب العلم، ومسلم/رقم ٢٦٧١.

واتە: بێگومان لە نیشانەکانی هاتنی کاتی دنیا خرابون و نزیک بونەوەی قیامەتە، کە عیلم و زانیاری هەڵدەگیرێ و بەرز دەکرێتەوە و کەمدەکرێت، بەهۆی مردنی زانایان و کەم بونەوەی فێرخواز (طالب العلم) و، نەزانی بڵاو دەبێتەوە و جێگیردەبێت و کاروباری خەڵکی دەکەوێتە دەست نەزانان، شەراب زۆر دەخورێتەوە، شەڕواڵ پیسی و زیناکردن دەردەکەوی و زۆر بە ئاشکرایی دەکرێ.

٩. عن النعمان بن بشير رضي الله عنه قال: قال رسول الله ﷺ مثل المؤمنين في توادهم و تراحمهم و تعاطفهم مثل الجسد اذا اشتكى منه عضو تداعى له سائر الجسد بالسهر والحمى. متفق عليه

واتە: وێنەی بڕواداران لە یەکتر خۆشویستن و بەزەیی بەیەکدا هاتنەوە و سۆز نواندن بەرامبەر بە یەکتر، وەکو وێنە و نمونەی لاشەیەك وایە، کە کاتێك پارچە و ئەندامێکی کەوتە ئازار و ناڕەحەتیەوە، سەرجەم لاشەکە بۆی دێتە تاوو لەرز و، ناڕەحەتی و شەونخونی کێشان (سهر) لەسەری.

١٠. عن أنس رضي الله عنه قال: قال رسول الله ﷺ : لا تقاطعوا ولا تدابروا ولا تباغضوا ولا تحاسدوا وكونوا عباد الله اخوانا، ولا يحل لمسلم أن يهجر أخاه فوق ثلاث. متفق عليه

واتە: لە یەك دامەبڕێن و واز لە یەکتری مەهێنن و، پشت لە یەکتری مەکەن، یەکتر مەبوغزێنن و رق و کینە لە یەکتر دامەگرن، ئێرەیی و حەسودی بە یەکتری مەبەن، هەموتان بەندەی خوا و برا بن و یەکتریتان خۆش بوێت و بەزەییتان بە یەکتریدا بێتەوە، حەلاڵ نییە بۆ هیچ موسڵمانێکی، کە دەنگ لە برایەکەی خۆی وەربگری و قسەی لەگەڵ نەکات زیاتر لە سێ ڕۆژی یان سێ شەو.

١١- عن أبي سعيد الخدري وأبي هريرةرضي الله عنه عن النبيﷺ قال: ما يصيب المسلم من نصب ولا وصب ولا هم ولا حزن ولا أذى ولا غم حتى الشوكة يشاكها إلاّ كفّر الله بها من خطاياه.

رواه البخاري في صحيحه رقم ١٨٥٧، ومسلم رقم ٢٥٧٣.

واتە: موسڵمان توشی هیچ ماندویی و نەخۆشی و ناڕەحەتی و پەستی و مەراق و خەفەت خواردن و ئازار پێگەیشتن و پەژارە و خەم نابێت تەنانەت کە دڕکیش لە قاچی (بە پێیدا) داچێت، ئیلا خوای گەورە بەو شتانە و ئارام گرتن لەسەریان، لە گوناهەکانی هەڵدەوەرێنی.

١٢- عن أبي هريرةرضي الله عنه قال: قال رسول اللهﷺ ما من يوم يصبح العباد فيه إلاّ ملكان ينزلان فيقول أحدهما الله أعط منفقاً خلفاً ويقول الآخر اللهم اعط ممسكاً تلفاً.

رواه البخاري في صحيحه رقم/٦٩١ باب الزكاة، ومسلم/١٠١٠ باب الزكاة.

واتە: هیچ ڕۆژێك نییە، کە بەندەکانی خوا ڕۆژی تێدا دەکەنەوە، مەگەر دوو فریشتە دێنە خوارەوە، یەکێکیان دەڵێت: خوایە! هەرکەسێ سامان و ماڵی دەبەخشێت و (صدقە) دەکات ماڵی پێ ببەخشە و بیدەیێ، ئەوی تریش دەڵێت: خوایە! هەر کەس دەگرێتەوە لە ماڵ و بەخشین ماڵەکەی لەناو بەری و بیفەوتێنی و بە تەلەفی دەیت.

١٣ـ عن أبي هريرةﷺ أن رسول اللهﷺ قال: ينزل ربنا تبارك و تعالى كل ليلة الى السماء الدنيا حين يبقى ثلث الليل الآخر، يقول: من يدعوني فاستجب له، من يسألني فأعطيه، من يستغفرني فأغفر له.

رواه البخاري في صحيحه رقم/٥٧٢ وأخرجه مسلم في صلاة المسافرين وقصرها رقم/٧٥٨.

واته: پەروەردگاری پیرۆز و بەرزمان دادەبەزێت (بە دابەزینێك كە لە خۆی دەوەشێتەوە و شایستەی خۆیەتی) هەمو شەوێك بۆ ئاسمانی یەكەم كاتێك، كە سێیەكی (١/٣)ی كۆتایی شەو دەمێنێتەوە، دەفەرموێت: كێ دەپاڕێتەوە لێم، تا بە دەنگیەوە بچم، كێ داوام لێدەكات تا بیدەمێ و پێی ببەخشم، كێ داوای لێ بوردن و لێ خۆشبونم لێدەكات، تا لێی خۆش ببم.

١٤ـ عن أبي هريرةﷺعن النبيﷺ قال: لا تشدُ الرحال الأ الى ثلاثة مساجد: المسجد الحرام، ومسجد الرسولﷺ ومسج الاقصى.

رواه البخاري رقم/٥٨٦ وأخرجه مسلم رقم/١٣٩٧.

واته: سەفەر و كۆچكردن بە مەبەستی خواپەرستی و نوێژكردن ناكرێت و بارگە و بار ناپێچرێتەوە تەنها بۆ سێ مزگەوت نەبێ:

١ـ مزگەوتی حەرام كە مزگەوتی مەككەی پیرۆزە.
٢ـ مزگەوتی پێغەمبەرﷺ لە مەدینەی گەش و ڕوناك.
٣ـ مزگەوتی (اقصی)، كە مزگەوتی (بيت المقدس)ە لە فەلەستین.

١٥ـ عن البراءﷺ قال: أمرنا النبيﷺبسبع و نهانا عن سبع: (أمرنا باتباع الجنائز وعيادة المريض، وإجابة الداعي، ونصر المظلوم، وإبرار القسم، وردَ السلام، وتشميت العاطس، ونهانا عن آنية الفضة وخاتم الذهب والحرير والديباج والقَسيِّ والاستبرق. رواه البخاري في صحيحه رقم/٦٠٠ ومسلم رقم/٩٤.

واته: پێغەمبەرﷺ فەرمانی پێكردوین بە حەوت شت و قەدەغەشی كردوین لە حەوت شت: فەرمانی پێ كردووین بە:

١ـ ڕۆیشتن و شوێنكەوتنی مردوو بۆ سەر گۆڕستان و بەڕێ كردنی.

٢ـ سەردانی نەخۆش.

٣ـ بە دەنگەوە چونی کەسێك کە داوات (دعوة)ت دەکات بۆ ژن خواستن بە مەرجێك کاری بی شەرعی لێ نەکرێ.

٤ـ سەرخستنی ستەم لێکراو و یارمەتی دانی.

٥ـ سوێند نەکەواندنی کەسێك کە سوێندت لێ دەخوات بە ئەنجامدانی کارێك، کە داوات لێدەکات بە مەرجێك کارەکە حەڵاڵ بێت.

٦ـ وەڵام دانەوەی سەلام.

٧ـ پاڕانەوە لەسەر بەردەوامبونی تاعەتی خوا بۆ ئەو کەسەی، کە دەپژمی و دەڵێ (الحمد لله) ئینجا تۆش پێی دەڵێی (یرحمك الله).

هەروەها قەدەغەی کردوین لە:

١ـ بەکارهێنانی قاپی زیو بۆ خواردن و خواردنەوە.

٢ـ ئەنگوستیلەی زێڕ.

٣ـ جل و بەرگی ئاوریشم.

٤ـ بەکارهێنانی دیباج کە جۆرە پۆشاکێکە لە ئاوریشم دروستدەکرێ و جۆرێکە لە ئاوریشم.

٥ـ بەکارهێنانی بەرگی کەتانی تێکەڵ بە ئاوریشم.

٦ـ بەکارهێنانی بەرگی ئەستور و قایم لە دیباجی ئاوریشم.

١٦ ـ عن أبي هريرةﷺ قال: قال رسول اللهﷺ: ما من مولود إلأ يولد على الفطرة، فأبواه يهودانه، أو ينصرانه، أو يمجسانه، كما تنتج البهيمة بهيمة جمعاء، هل تحسون فيها من جدعاء؟. ثم يقول أبو هريرةﷺ (فِطرَةَ اللهِ الَّتِي فَطَرَ النَّاسَ عَلَيْهَا لاَ تَبْدِيلَ لِخَلْقِ اللهِ ذَلِكَ الدِّينُ القَيِّمُ وَلَكِنَّ أَكْثَرَ النَّاسِ لاَ يَعْلَمُونَ). رواه البخاري في صحيحه رقم/٦٤٤ و مسلم رقم/٢٦٥٨.

واتە: هەمو لە دایك بوێك لەسەر سروشتی بڕوابون بە خوا و یەكتاپەرستی لە دایك دەبێت، بەڵام باوك و دایكی لای دەدەن و دەیكەن بە جولەكە، یان بە گاور، یان بە ئاگر پەرست، هەروەكو چۆن ئاژەڵ ئاژەڵی تەواو و ڕێك و پێكی لێ پەیدا دەبێت، ئایا هەستدەكەن و دەبینن لەو ئاژەڵەدا هیچ كەموكوڕی و گوێ و لوت بڕاویەك، یان شتی تر؟

(واتە ئاژەڵەكان لە بنچینەدا تەواون، بەڵام خەڵكی گوێ و لوت و...هتد. یان دەبڕن بە هەمان شێوە منداڵە ساغ و سروشت پاكەكانیش ئاوایان لێدەكرێ)، پاشان أبو هریرة ئەم ئایەتەی خوێندەوە (فِطرَةَ اللهِ الَّتِي فطَرَ النَّاسَ عَلَيهَا لاَ تبدِيلَ لِخَلقِ اللهِ ذَلِكَ الدِّينُ القَيِّمُ وَلَكِنَّ أَكثَرَ النَّاسِ لاَ يَعلَمُونَ)[1].

١٧ـ عن أبي هريرةرضي الله عنه أن رسول اللهﷺ قال: (إذا جاء رمضان فتحت ابواب الجنة) وعنه في رواية قال: قال رسول اللهﷺ إذا دخل شهر رمضان فتحت ابواب السماء وغلقت ابواب جهنم وسلسلت الشياطين.

رواه البخاري في صحيحه رقم/٨٧٤ باب الصوم و مسلم رقم/١٠٧٩ باب الصيام.

واتە: كاتێك، كە ڕەمەزان هات هەمو دەرگاكانی بەهەشت دەكرێنەوە لە ڕیوایەتەكەی دیدا: كاتێك، كە مانگی ڕەمەزان هات هەمو دەرگاكانی ئاسمان دەكرێنەوە و دەرگاكانی دۆزەخ هەمویان دادەخرێن و شەیتانەكان هەمویان كۆچت و زنجیر دەكرێن.

١٨ـ عن عائشةرضي الله عنها أن رسول اللهﷺ قال: (من مات وعليه صيام صام عنه وليه). رواه البخاري في صحيحه رقم/٨٩٩ و مسلم رقم/١١١٨ باب الصيام.

واتە: هەر كەسێك بمری و ڕۆژوی (واجبی) لەسەر بێت ئەوا وەلی و خزمی نزیكی ـ هەرچەندە میرات گریشی نەبێت ـ ڕۆژووەكەی لەبری ئەو دەگرێتەوە.

---

١ـ الروم/ ٣٠.

١٩- عن ابن عمرﷺ ان رسول اللهﷺ قال: (المسلم اخو المسلم لا يظلمه ولا يسلمه، ومن كان في حاجة أخيه كان الله في حاجته ومن فرّج عن مسلم كربة فرّج الله عنه كربة من كربات يوم القيامة، ومن ستر مسلماً ستره الله يوم القيامة).

رواه البخاري في صحيحه رقم/١٠٥٩ كتاب المظالم ومسلم رقم/٢٥٨٠ باب تحريم الظلم.

واتە: موسڵمان برای موسڵمانە، ئینجا نە ستەمی لێ دەکات وە نە دەشیداتە دەستی ستەمکار - واتە بە ستەمکاری ناسپێرێ - ، هەر کەسێك لە جێبەجێ کردنی پێویستی براکەیدا بێت، خوای گەورەش یارمەتی دەدات بۆ جێبەجێکردنی پێویستی خۆی، هەر کەسێك نارەحەتی و دەرویەك لە موسڵمانێك بکاتەوە، ئەوە خوای گەورە دەرویەکی لێ دەکاتەوە لە دەرو و کۆسپەکانی ڕۆژی قیامەت، هەر کەسێك عەیب و عاری موسڵمانێك دابپۆشێ، ئەوا خوای گەورە لە ڕۆژی قیامەتدا عەیب و عاری ئەو دادەپۆشێ.

٢٠- عن أنسﷺ قال: قال رسول اللهﷺ : (أنصر أخاك ظالماً أو مظلوماً) قالوا: يا رسول الله، هذه ننصره مظلوماً، فكيف ننصره ظالماً؟ قال: (تأخذه فوق يديه). رواه البخاري في صحيحه رقم/١٠٦٠.

واتە: یارمەتی براکەت بدە و سەری بخە جا ستەم کاربێت، یان ستەم لێکراو، گوتیان ئەی پێغەمبەری خواﷺ ئەوە یارمەتی دەدەین و سەری دەخەین کە ستەم لێکراو بێت، بەڵام چۆن یارمەیت بدەین، کە ستەمکارە؟ فەرموی: دەستی دەگری و ڕێگەی ستەمکردنی لێدەگری و ناهێڵی بیکات.

٢١ - عن ابن عمرﷺ قال: قال رسول اللهﷺ: (من أخذ من الارض شيئاً بغير حقه خسف به يوم القيامة الى سبع أرضين).

رواه البخاري في صحيحه رقم/١٠٦٤.

واتە: هەر کەسێك شتێك لە زەوی وەرگری و دایبگرێ بە بێ ئەوەی حەقی پێوەی هەبێت و بە ناحەق دایبگرێ ئەوە لە ڕۆژی قیامەتدا بە حەوت زەویاندا دەڕۆیێنرێتە خوارەوە.

٢٢ـ عن ابن عمرﷺ أن النبيﷺ قال: (من كان حالفاً فليحلف بالله أو ليصمت).

رواه البخاري في صحيحه رقم/١١٢٥.

واتە: (هەر کەسێك دەیەوێت سوێند بخوات با سوێند بە خوا بخوات، یان بێدەنگ بێت و سوێند نەخوات بە هیچ جۆرێك).

٢٣ـ عن أبي هريرةﷺ عن النبيﷺ قال: (اجتنبوا السبع الموبقات) قالوا يا رسول الله، وما هنّ؟ قال: (الشرك بالله، والسحر، وقتل النفس التي حرّم الله إلاّ بالحق، وأكل الربا، وأكل مال اليتيم، والتولي يوم الزحف، وقذف المحصنات المؤمنات الغافلات). رواه البخاري في صحيحه رقم/١١٤٢ ومسلم رقم/٨٩ باب بيان الكبائر وأكبرها.

واتە: خۆتان دوور بگرن لەو حەوت تاوانە گەورە و لە ناو بەرانە: گوتیان ئەی پێغەمبەری خوا ئەو حەوت تاوانە کوشندانە چین ؟ فەرموی: شیرك و هاوبەش بڕیاردان بۆ خوا، جادوو و سیحر و تەڵەکەبازی، کوشتنی ئەو نەفسەی، کە خوا حەرامی کردوە کوشتنی، مەگەر بە حەقی خۆی بێت، خواردنی سود (ربا)، خواردنیماڵی هەتیو، پشت هەڵکردن وهەڵاتن لە شەڕدا لە کاتی ڕوبەڕوبونەوەی بەرەی حەق و بەرەی ناحەق، بوختان هەڵبەستن و تۆمەتدارکردنی ئافرەتی پاك داوێن و بڕوادار و بێ ئاگا.

٢٤ ـ عن أبي موسىﷺجاء رجل الى النبيﷺ فقال: الرجل يقاتل للمغنم، والرجل يقاتل للذِكر، والرجل يقاتل ليرى مكانه، فمن في سبيل الله؟ قال: (من قاتل لتكون كلمة الله هي العليا فهو في سبيل الله).

رواه البخاري في صحيحه رقم/١١٦٠ ومسلم رقم/١٩٠٤ في الامارة.

واتە: پیاوێك هاتە لای پێغەمبەرﷺ گوتی: پیاوی وا هەیە دەجەنگێ، تا غەنیمەت و دەستکەوتی دەستکەوێت، پیاوی وا هەیە دەجەنگێ تا باسی بکرێت و ناوی بلاوبێتەوە، پیاوی وا هەیە دەجەنگێ، تا خەڵکی پلەی ئازایەتی ببینن، ئینجا کامیان لە پێناوی خوادایە؟

پێغەمبەرﷺ فەرموی: هەر کەسێك بجەنگێت بۆ ئەوەی تەنها ووشەی خوا بەرز و شەکاوە بێت ئەوە لە پێناوی خوادایە.

٢٥ـ عن عبدالله بن عمرﷺ قال: سمعت النبيﷺ يقول: (إنما الشؤم في ثلاثة: في الفرس و المرأة والدار). رواه البخاري في صحيحه رقم/١١٨١.

واتە: (ڕەش بینی ـ تشاؤم ـ تەنها لە سێ شت دایە:

١ـ لە ئەسپ و ولاخی سواری ـ کە چەموش بێ و غەزای لەسەر نەکرێ.

٢ـ لە ئافرەتدا کاتێك، کە زمان سوار و زمان شڕە رازی نییە و قەناعەتی نییە بە ژیانی خۆی و ماڵ و منداڵەکەی.

٣ـ خانوو کاتێك کە تەسك و بەرتەنگ و لە یەك نزیکە.

٢٦ـ عن أبي هريرةﷺ عن رسول اللهﷺ قال: (لا تقوم الساعة حتى تقاتلوا اليهود، حتى يقول الحجر وراءه اليهودي، يا مسلم هذا اليهودي ورائي فاقتله).

رواه البخاري في صحيحه رقم/١٢٠٢ و مسلم باب الفتن واشراط الساعة رقم/٢٩٢٢.

واتە: (قیامەت دانایەت، تاوەکو دەجەنگێن لەگەڵ جولەکەدا، تا ئەو بەردەی کە جولەکەکە لە دواوەیدا خۆی مەلاسداوە دەڵێ: ئەی موسڵمان ئەوە جولەکەیە لە پاش منە و بیکوژە).

٢٧ـ عن ابن عمرﷺ عن النبيﷺ قال: (لو يعلم الناس ما في الوحدة ما أعلم، ما سار راكب بليل وحده). رواه البخاري في الصحيح رقم/١٢٢٨.

واتە: ئەگەر خەڵکی دەیانزانی چەندە تاکڕەوی و تەنهایی خراپە و زیانی هەیە ئەوەندەی، کە من دەیزانم، سوار چاك شەو بە تەنهایی نەدەڕۆیشت بە ڕێگەدا.

٢٨ـ عن أبي طلحةﷺ وكان قد شهد بدراً مع رسول اللهﷺ انه قال: (لا تدخل الملائكة بيتاً فيه كلب ولا صورة). يريد صورة التماثيل التي فيها الأرواح.

رواه البخاري في صحيحه رقم/١٥٣٢ كتاب المغازي.

واتە: فریشتەکان ناچنە ماڵێك، کە سەگ و وێنەی تێدا بێ.

ئەبو طلحة دەفەرموی مەبەستی ئەو (تمثال) و هەیکەلانەیە کە گیانلەبەرن لە ئادەمیزاد و ئاژەڵ.

٢٩ـ عن أبي موسىﷺ عن النبيﷺ قال: (مثل الجليس الصالح والسوء كحامل المسك و نافخ الكير، فحامل المسك: إما أن يحذيك، واما أن تبتاع منه، واما ان تجد منه ريحاً طيبة، ونافخ الكير: اما ان يحرق ثيابك، واما ان تجد منه ريحاً خبيثة).

رواه البخاري في صحيحه رقم/١٨٣٦ و مسلم رقم/٢٦٢٨ باب استحباب مجالسة الصالحين.

واتە: نمونە و وێنەی هاوڕێی چاك و خراپ وێنەی میسك هەڵگر (عەتر فرۆشێك) و کورەچی یەك وایە.

چونکە عەتر و میسك فرۆش: یان کەمێك لە میسك و بۆنە خۆشەکەت دەداتێ، یان لێی دەکڕێ یان بۆنی خۆشت لا دەست دەکەوێت و بۆنی خۆشت بۆ دێت، بەڵام کورەچی، یان جلەکانت دەسوتێنێ، یان بۆنێکی ناخۆشت بەردەکەوێ و بۆت دێت.

٣٠ـ عن ابي هريرةﷺ عن النبيﷺ قال: (من تردى من جبل فقتل نفسه، فهو في نار جهنم يتردى فيه خالداً مخلداً فيها أبداً، ومن تحسّى سماً فقتل نفسه

فسمه في يده يتحساه في نار جهنم خالداً مخلداً فيها أبداً، ومن قتل نفسه بحديدة فحديدته في يده يجأبها في بطنه في نار جهنم خالداً مخلداً فيها ابداً).

رواه البخاري رقم/١٨٨٩ و مسلم رقم/١٠٩.

واتە: هەرکەسێك خۆی فڕێ داتە خوار لە شاخێك ئینجا خۆی بکوژێ، ئەوە لە ئاگری دۆزەخدایە هەتا هەتایە خەریکی خۆ خلۆرکردنەوە و خۆهەڵدانە، هەر کەسێك ژەهر بخواتەوە و خۆی بکوژێ ئەو ژەهرەکەی لە دەستی دایە و دەیخواتەوە لە ئاگری دۆزەخدا بە بەردەوامی و هەتا هەتایە، هەر کەسێك خۆی بکوژێت بە ئاسنێك، ئەوە ئاسنەکەی لە دەستیدایە و بەردەوام پێی لە سکی خۆی دەدات و لە سکی خۆی ڕادەکات لە ئاگری دۆزەخدا بە بەردەوامی هەتا هەتایە.

٣١ـ عن ابن عمرﷺعن النبيﷺ قال: (خالفوا المشكرين: وفروا اللحى، وأحفوا الشوارب). البخاري رقم/١٩٠٤ و مسلم رقم/٢٥٩.

واتە: (پێچەوانە و جیاواز بن لە هاوبەش پەیداکەران: بەوەی: ڕیشتان بەردەنەوە، سمێڵەکانتان لابەرن، یان کورت و سوکیان بکەنەوە).

٣٢- عن أبي هريرةﷺ عن النبيﷺ انه قال: (لا يلدغ المؤمن من جُحرٍ واحد مرتين). البخاري رقم/١٩٥٣ و مسلم رقم/٢٩٩٨.

واتە: (ئیماندار لەیەك کون و لە یەك شوێنەوە دوو جار ناگەزرێ و هەڵناخەڵەتێنرێ).

٣٣ـ عن عائشة (رضي الله عنها) أنها قالت: سئل النبيﷺ : أي الأعمال أحب الى الله؟ قال: (أدومها وإن قلَ). البخاري/رقم/٢٠١١.

واتە: پرسیارکرا لە پێغەمبەرﷺچاکترین و خۆشەویسترین کردەوە لە لای خواوە کامەیە؟ فەرموی: (ئەو کردەوەیەی، کە خاوەنەکەی بەردەوامە لەسەری باکەم بێت و زۆریش نەبێت).

٣٤. عن أبي هريرةﷺ ان رسول اللهﷺ قال: (حُجِبَت النار بالشهوات وحجبت الجنة بالمكاره). البخاري/رقم/٢٠١٦ و مسلم رقم/٢٨٢٢، ٢٨٢٣.

واتە: (دۆزەخ و ئاگر داپۆشراوە بەو شتانەی، کە ئارەزووی مرۆڤ حەزیان لێدەکات، کە بەهۆیانەوە واز لە واجبەکان دێنی و دەکەوێتە ناو حەرامەوە، بەهەشتیش داپۆشراوە بەو کارە سەخت و ناخۆشانەی، کە پێویستن بۆ ئەنجام دانی فەرمانەکانی خوا و وازهێنان لە حەرامەکان).

٣٥. عن أبي هريرةﷺ أن النبيﷺ قال: (لا يموت لأحد من المسلمين ثلاثة من الولد تمسه النار الأ تحلة القسم). البخاري/رقم ٢٠٥٣ و مسلم/رقم/١٢٧.

واتە: (هەر موسڵمانێك سێ منداڵی لێ بمرێ ئاگر نایگاتێ و توشی ئاگر نابێ، تەنها بەشی سوێند نەبێ) چونکە خوا بەڵێنی داوە، کە دەبێ هەمو کەس تێپەڕێ بەسەر ئەو پردەی، کە بەسەر دۆزەخدا ڕاکشاوە ﴿وَإِن مِّنكُمْ إِلَّا وَارِدُهَا﴾ مريم/٧١,

٣٦. عن عبدالله بن عمرﷺ عن النبيﷺ قال: (من حمل عليها السلاح فليس منا).البخاري/رقم/٢٠٧٥.

واتە: (هەر کەسێك چەك لە دژمان هەڵگرێت و بجەنگێت لە گەڵمان بەهۆی دینەکەمانەوە و شەڕ لە گەڵمان بە حەڵاڵ بزانێت، ئەوە لەسەر ڕێگە و ڕێبازی ئێمە نییە و دەرچوە لە ئاین و دینی ئێمە).

٣٧ـ عن ابن عمرﷺ أن رسول اللهﷺ قال: (أمرت أن أقاتل الناس حتى يشهدوا ان لا اله الأ الله وأن محمداً رسول الله، ويقيموا الصلاة و يؤتوا الزكاة، فاذا فعلوا ذلك عصموا مني دماءهم و أموالهم إلأ بحق الاسلام و حسابهم على الله). البخاري/رقم/٢٣ و مسلم/رقم/٢٢.

واتە: (فەرمانم پێکراوە، کە بجەنگم لەگەڵ خەڵکیدا (لە دوای گەیاندنی ئیسلام پێیان) تاوەکو شایەتمانی و شاهێدی دەدەن، کە هیچ پەرستراوێکی بە ڕاستی نییە، جگە لە خوا، دان دەنێن بەوەی کە (محمد) پێغەمبەری خوایە و

نوێژ دەکەن بە رێك و پێکی، زەکاتی ماڵیان دەدەن، ئینجا ئەگەر ئەمانەیان کرد خوێن و ماڵیان پارێزراو دەبێت لە لایەن منەوە، مەگەر بە حەق و مافی ئیسلام - کە کارێك بکەن ببێتە مایەی سزایەکی ماڵیی یان لاشەیی - لێپێچانەوە و حسابیان لەسەر خوایە بۆ ئەو کارانەی کە لە نهێنیدا ئەنجامی دەدەن).

٣٨. عن عبدالله بن عمروﷺ أن النبيﷺ قال: (أربع من كنَ فيه كان منافقا خالصاً، ومن كانت فيه خصلة منهنَ كانت خصلة من النفاق حتى يدعها: اذا أؤتمن خان، واذا حدث كذب، واذا عاهد غدر، واذا خاصم فجر). البخاري/رقم/٣٢ و مسلم/رقم/٥٨.

واتە: چوار شت هەن لەهەر کەسێکدا بن ئەوە دووڕو (منافق)ێکی تەواوە، هەر کەسێك سیفەتێکی لەو چوارانە تێدا بێت ئەوە خاڵ و سیفەتێکی دووڕوی تێدایە تا وازی لێ دێنی و لە خۆی دادەڕنی:

١. کاتێك شتێکی پێ سپێرا، یان بە ئەمین دانرا خیانەت دەکات.

٢. کاتێك کە قسەیەکی کرد درۆی تێدا دەکات.

٣. ئەگەر پەیمان و بەڵێنێکی دا لەگەڵ یەکێکدا پەیمانەکەی دەشکێنی و نایباتە سەر.

٤. کاتێك، کە کێشە و دەبەرێك ڕاچونی لەگەڵ یەکێکدا هەبو لە حەق لادەداو سنور دەشکێنێ.

٣٩. عن زيد بن خالد الجهنيﷺ أن رسول اللهﷺ قال: (من جهزَ غازياً في سبيل الله فقد غزا، ومن خلف غازياً في سبيل الله فقد غزا). البخاري/رقم/١١٧١، ومسلم/رقم/١١٥٣.

واتە: (هەر کەسێك جەنگاوەرێك ساز بدا و وەرێی بخات و پێداویستییەکانی سەفەر و جیهادی بۆ دابین بکات لە پێناوی خوادا، ئەوە بێگومان وەکو بۆ خۆی لە ڕیزی غەزا و جیهاد بێ وایە و پاداشتی جەنگ و جیهاد و غەزایەکەی بۆ

دەنوسـرێت بـا ئامـادەش نـەبوبێت، چـونکە جـەنگاوەرێکی وەڕێ خسـتوە و سازداوە. هەر کەسێك لەجیاتی جەنگاوەرێك پێداویستییەکانی ماڵی جێبەجێ بکات لە کاتێکدا کە خۆی لێرە نییە و لە غەزایە بە جوانی و ئەمانـەت و دڵسۆزییەوە و لە پێناوی خوادا، ئەوە بە ڕاستی جەنگاوە و غەزای کردوە و پاداشتی جەنگاوەرەکەی هەیە).

٤٠ـ عن ابن عمر رضي الله عنه عن النبي ﷺ قال: (السمع و الطاعة حق ما لم يؤمر بالمعصية، فاذا أمر بمعصية فلا سمع ولا طاعة). البخاري. رقم/١٢١٠.

واتە: (گوێگرتن ـ بیستن ـ و بە گوێکردن پێویستە (واجبە) بۆ پێشڕەو و ئیمامی موسڵمانان لەسەر گشت خەڵکی، مادام فەرمان ناکرێت بە کارێکی گونـاه، یـان بـە ئەنجامـدانی تاوانێـك، ئینجا ئەگەر فەرمانـدرا بـە تـاوان و گوناهێـك ئـەوە ئەوکاتـە نـە گوێگرتن و بیسـتن هەیـە و نـە بـە گـوێکردن و گوێڕایەڵیش هەیە).

٤١ـ عن معاذ رضي الله عنه قال: كنت رديف النبي ﷺ على حمار يقال عُفَير، فقال: (يا معاذ، هل تدري حق الله على عباده، وما حق العباد على الله). قلت: الله ورسوله أعلم، قال: (فان حق الله على العباد أن يعبدوه، ولا يشركوا به شيئاً، وحق العباد على الله، أن لا يعذب من لا يشرك به شيئاً)، فقلت: يا رسول الله، أفلا أبشر به الناس؟ قال: (لا تبشرهم فيتكلوا). البخاري/رقم/١١٧٩ كتاب الجهاد و مسلم /رقم/٣٠/كتاب الايمان.

(ردف) راكبا خلفه (عفير) من من العفرة وهي حمرة يخالطها بياض.
(من لا يشرك به شيئاً) أي وقد عبده حق عبادته بالتزام أمره و اجتناب نهيه.
(فيتكلوا) فيعتمدوا على ذلك ولا يجتهدون في الخير والطاعة.

تێبینی: پێویستە مامۆستا بۆ خۆی بە دوای واتای ئەم فەرمودەیەدا بگەڕێت.

عن شداد بن أوس رضي الله عنه عن النبي ﷺ قال: (سيد الاستغفار أن تقول: اللهم أنت ربي، لا اله إلاّ أنت، وأنا عبدك، وأنا على عهدك، ووعهدك ما استطعت، اعوذ بك من شر ما صنعت، أبوء لك بنعمتك عليّ وأبوء بذنبي، فاغفر لي، فانه لا يغفر الذنوب إلاّ أنت. قال: ومن قالها من النهار موقناً بها، فمات من يومه قبل أن يمسي، فهو من أهل الجنة، ومن قالها من الليلة وهو موقن بها فمات قبل ان يصبح فهو من أهل الجنة). رواه البخاري رقم/١٩٧٦ كتاب الدعوات وابو داود باختلاف يسير

واتە: (گەورەترین و چاکترین دوعا و پاڕانەوە ئەوەیە، کە بڵێت:

ئەی خوا: تۆ پەروەردگاری منی، هیچ پەرستراوێکی بە ڕاستی نییە، جگە لە تۆ، تۆ دروستت کردووم، منیش بەندەی تۆم، من لەسەر ئەو پەیمان و بەڵێنەم، کە بە تۆم داوە، لە ئیمان پشت بەستن و خواپەرستی ڕاستەقینە بە تۆو بۆ تۆ بە پێی توانا و بۆ کرانم، پەنا دەگرم بە تۆ لە زیان و خراپەی ئەوەی، کە کردومە، دانت بۆ پێدا دەنێم، کە چاکە و نیعمەتت بەسەر منەوە هەیە، دان دەنێم بە گوناهو تاوان و هەڵەی خۆمدا، جا لێم خۆشبە و لێم ببورە، چونکە بێ گومان جگە لە تۆ کەس گوناه و تاوان و هەڵان نابورێت و خۆش نابێت).

فەرموی: هەر کەسێك ئەمە بڵێت: لە ڕۆژێدا بە دڵسۆزی و لە دڵیەوە بێتو متمانەی تەواوی پێ هەبێت، ئینجا کە مرد لەو ڕۆژەیدا پێش ئەوەی ئێوارەکەی بکاتەوە، ئەوە لە ئەهلی بەهەشتە.

هەر کەسێك لە شەوێدا بیڵێ و بە دڵسۆزی و متمانەی تەواوی پێ هەبێت و ئینجا بمرێت پێش ئەوەی بەیانی بکاتەوە، ئەوە لە ئەهلی بەهەشتە، چونکە بە زۆری وایە ئەوەی متمانەی تەواوی بە ناوەڕۆکی ئەم دوعایە هەبێت و بێ فەرمانی خوا نەکات، خوای گەورە عەفوی دەکات و لێی دەبورێت بەهۆی فەڕ و بەرەکاتی ئەم دوعایە.

سەرنجێك: بۆیە ئەم دوعایە (سید الأستغفار)ە، چونكە دە (١٠) بنچینە و بنەمای گرتۆتە خۆ، كە مرۆڤ بەرەو خوا دەبەن و رێگەی بەرەو خوا چونی پێ ئاشنا دەكەن، كە بە كورتی بریتین لە:

١ـ دان هێنان بە پەروەردگارێتی (ربوبیة)ی خوا (اللهم أنت ربي).

٢ــ دان نـان بـە یـەكتایی پەرسـتراوێتی (الوهیـة)ی خـوا (لا الـه الأ أنـت). چونكە بـێ گومـان خـوا بـە مشـور خـۆر و گـەورە و سـەروەر و پـەروەردگاری خـۆزانین و یـەك خواپەرسـتیش گـەورەترین و ڕاسـترین و گرنگترینپایـە و بنچینەی ڕێی بەرەو خوا چونن.

٣ـ دان هێنان بە بەدی هێنەرایەتی خوا و خالقیەتی ئەودا (خلقتني).

٤ـ دان نان بە بەندایەتی و عەبدایەتی بۆ خودا (وأنا عبدك).

٥ـ ڕاگەیاندنی بەردەوامی و چەسپاوی لەسەر پەیمان و بەڵێنی خوا بـە پێـی توانا. (وأنا على عهدك ووعدك ما استطعت).

٦ـ پـەنا بردنـە بـەر خـوا لـە چـنگ خراپـە و تـاوان (اعـوذ بـك مـن شـر مـا صنعت). ئەمەش هەروەك وسیلە و هـۆی بـەرەو خـوا چونە، پایـە و بنچـینەی بەرەو خوا چونیشە.

٧ـ دان هێنان بە چاكە و نیعمەتی خوادا (أبوء لك بنعمتك علي).

٨ـ دان هێنان بە خراپە و هەڵەی خۆ (ذات)دا. (وأبوء بذنبي).

٩ـ داوای لێبوردن لە خوا كردن بە تەنها. (فاغفر لي).

١٠ـ تەما بڕوابون و بێ ئومێد بون لە غەیری خوا، (فانە لا یغفـر الـذنوب الا أنت). كە بە كورتی ئەمانەپایە و بنچینەی گرنگی ڕێی بەرەو خواچونن.

# بەشی (١٢)

# ژیان و بەسەرهاتی خواناسان

مجاهد دەڵێت: ئەوانەی یەکەمجار ئیسلامەتی خۆیان ڕاگەیاند، حەوت کەس بون.

(پێغەمبەرﷺ و ابوبکر و بیلال و صهیب و خباب و عەمار و سومەیەی دایکی عەممار). بە نیسبەت پێغەمبەرﷺ خۆیەوە مامی پارێزگاری لێدەکرد و، ئەبوبەکریش قەومەکەی بەرگری لێدەکرد، ئەوانی دیکەش کۆت و زنجیر دەکران و ناچار کران داواکارییەکانی ئەوان بەجێ بهێنن و خۆیان بۆ نەگیرا تەنها بیلال نەبێت، کە خۆی خستبوە لاوە لە پێناوی خوادا. بۆیە تاوانبارانی بێزار کرد، ناچار بون پەتێکیان خستە ملی و دایانە دەست منداڵان، بە ناو مەککەدا دەیانگێڕا و، ئەویش هەر دەیگوت (احد..احد..).

محمدی کوڕی اسحاق دەڵێت: کاتێك کە گەرما تاوی دەسەند ئومەییە بیلالی دەبردە بەر خۆرەکە و لەسەر لمی سورەوە بوی مەککە بە پشتدا ڕایدەخست و ئەمری دەکرد بەردێکی گەورەیان دەخستە سەر سکی، پاشان پێی دەگوت: دەبێت ئاوا بی تادەمری، یان پەشیمان دەبیەوە لە شوێن کەوتنی (محمد) ﷺ وەلات و عوززا دەپەرستی، بەلام بیلال لەم حاڵەتەشدا هەر دەیگوت: (احد..احد..).

(عروە بن الزبیر) لە باوکیەوە دەگێڕێتەوە، کە (وەرەقەی کوڕی نەوفەل) تێپەڕی بە لای بیلال دا کاتێ ئەشکەنجەی دەدرا و دەیگوت (احد احد) (الله)یە ئەی بیلال و ئەوجا ئاوڕی دایەوە بە لای (ئومەیەی کوڕی خەڵەفدا) و گوتی: سوێند بە خوا، ئەگەر لەسەر ئەم حاڵەتەدا بیکوژن ئەوا گۆڕەکەی دەکەمە جێگەیەکی پیرۆز، تاوەکو ڕۆژێك (ابوبکر) بەسەر ئەو حاڵەتەدا تێپەڕی و بە

ئومەییەی گوت: لە خوا بترسە و بەس ئازاری ئەو هەژارە بدە، ئەویش گوتی تۆ وات لێکردوە رزگاریشی بکە، ئەبوبەکریش گوتی: باشە غولامێکی لەوە بە توانـاترم هەیـە دەتـدەمێ تـۆش ئـەوەم بدەیـە، گـوتی باشـە، گۆڕیانـەوە و ئەبوبەکریش بیلالی ئازاد کرد لە کۆیلایەتی، کە بەوەوە حەوت کۆیلەی ئازاد کرد.

هەروەها یەکەم کەس کە بانگی دا (بیلال) بوو.

أبـي عبـدالله ی الهـوزنی دەڵێـت: بـیلالم بـینی پرسـیارم لێکـرد لـە بـارەی گوزەرانی پێغەمبـەرەوە، ئـەویش گـوتی: هـیچ شـتێکی نـەبو، سەرپەرشـتی ئـەو کاروبارانـەیم دەکـرد لـە سـەرەتای ژیـانی پێغەمبەرایەتییـەوە، تـا وەفـاتیکرد، کاتێك ڕوت و ڕەجاڵێك دەهاتە لای فەرمانی پێ دەدام دەچوم قـەرزم دەکـرد و کەل و پەلم بۆی دەکڕی و پۆشتەم دەکردەوە و خواردنم دەدایە..

عبدالله دەگێڕتەوە، کە پێغەمبەرﷺ چو بەسەر بیلالدا کۆمـەڵێك خورمـای لا بوو، فـەرموی ئـەوە چییە بـیلال؟ گوتی ئـەی پێغەمبـەری خـوا بـۆ خـۆت و میوانەکانتم هەڵگرتوە، فـەرموی: ناترسـی لـەوەی ئـاگری دۆزەخـی پێـوە بێـت، (فەرمودە بەناوبانگەکەی فەرمو) کە (انفـق یـا بـلال ولا تخش مـن ذي العـرش اقلالاً).

واتـە: (ببەخشـە ئـەی بـیلال خـەمی ئـەوەت نـەبێت خـوای خـاوەن عـەرش لێمان کەم بکاتەوە).

ئەنەس دەگێڕێتەوە، کە پێغەمبەرﷺ فەرموی: کاتێك بـوە، کـە لەبـەر خـوا ترسێنراوم، کە کەس نەترسێنراوە، کاتێك بوە لەبەر خوا ئازار دراوم، کە کـەس ئازار نەدراوە، (٣٠) ڕۆژ تێپـەڕیوە بەسـەرماندا مـن و بـیلال، کـە خواردنێکمـان نەبوە، مەگەر ئەو شتەی لە بن دەستی بیلال دا بو بێ.

(عبـدالله بـن بریـدة) دەڵێـت: گـوێم لێ بـو بـاوکم دەیگـوت: بەیانییـەکیان پێغەمبـەرﷺ بیلالـی بـانگکرد و فـەرموی: ئـەی بـیلال بـە چـی پـێش منـت داوەتەوە لە بەهەشتدا؟ هەرچەندە دەچمە بەهەشت، لـە پـێش خۆمـەوە گوێم

لە دەنگی پێتە، دوێنێ چومە بەهەشت گوێم لە دەنگی پێت بو، گوتی: هەرچەندە دەستنوێژم دەشکێ خێرا دەست نوێژم تازە دەکەمەوە و دوو ڕکات نوێژ دەکەم، پێغەمبەرﷺ فەرموی: (ئەوە هی ئەمەیە)[١].

(محمدی ابراهیمی تەمیمی) دەڵێت: کاتێك پێغەمبەرﷺ وەفاتیکرد هێشتا بە خاك نەسپێردرا بو بیلال بانگی دا وە کاتێك دەیگوت: (اشهد ان محمداً رسول الله) خەڵکی لەناو مزگەوت خۆیان پێ ڕانەگیرا، پاش بە خاك سپاردنی (ابوبکر) فەرموی: ئەی بیلال بانگ دەفەرموێت:، ئەویش فەرموی: گەر منت بۆ ئەوە ئازادکردوە، کە لەگەڵ خۆتدا بم، ئەوە جیایە و، ئەگەر لەبەر خاتری خواش ئازادت کردووم، ئەو بمدەوە دەست خوا، ئەویش فەرموی: من تەنها لەبەر خوا تۆم ئازاد کردوە، بیلالیش گوتی: دەی کەواتە من پاش پێغەمبەری خوا بانگ بۆ کەس نادەم، ئەویش فەرموی ئەوەیان ئارەزوی خۆتە، ئیتر هەستاو کاتێك کاروانی شام هات لەگەڵیاندا چو بۆ شام.

زانایان بیروڕای جیاوازیان هەیە لەسەر شوێنی وەفاتکردنی بیلال، هەندێك دەڵێن: لە دیمەشق مردوە، هەندێکیدی دەڵێت لە حەڵەب مردوە لە تەمەنی شەست و ئەوەندەدەساڵیدا، ئیسلامەتی لە سەرەتاوە ئاوا هاتوە، ئاوا ئەشکەنجەدراون و بەو شێوەیەش بەرگەیانگرتوە، ژیان و گوزەرانیشیان بەو شێوەیە بوە و ئێمەش بەم حاڵە شرەوە خۆمان بە کوڕی ئەو مەیدانە و هەڵگری ئەو پەیامە دەزانین، مەگەر ڕوحمی بێ کۆتایی خوای بە بەزەیی لێمان بکەوێتە کار، دەنا ئێمە و ئەو مەقامە کوجا مەرحەبا.

---

١ـ أخرجه أحمد.

## وانەی دووەم: عبداللە ی کوڕی عمر

(عبداللە) پێش باڵغ بونی موسڵمان بو، هەر بە منداڵی هەوڵی دا، کە بەشداری جەنگەکانی (بەدر و احد) بکات، بەڵام لەبەر کەمی تەمەنی ڕێگە نەدرا تا لە تەمەنی (١٥)ساڵیدا بەشداری جەنگی خەندەقی کرد.

(نافع) دەگێڕێتەوە، کە عبداللە پێی گوتم لە خەونمدا پارچەیەك ئاوریشم بە دەستەوە بو، ئاراستەی هەر جێیەکی بەهەشتم دەکرد، دەفڕیم بۆ ئەوێ، (حفصە)ی خوشکم خەونەکەی گێڕایەوە بۆ پێغەمبەرﷺ ، ئەویش فەرموی: (إن أخاك رجل صالح)[1].

بۆ جێبەجێکردنی ئەو ئایەتەی، کە دەفەرموێت: ﴿لَن تَنَالُوا۟ ٱلْبِرَّ حَتَّىٰ تُنفِقُوا۟ مِمَّا تُحِبُّونَ ﴾[2]. واتە: ئەوپەڕی خێر و پاداشتان دەست ناکەوێ، تا نەبەخشن لەوەی، کە خۆشتاندەوێ.

عبداللە هەر نیعمەتێك دڵیگرتبێتی و حەزی لێکردبێ یەکسەر بەخشیویەتی، ئەو سیفەتەی لە سەرتاپێی ژیانیدا ڕەنگیدابویەوە، تەنانەت ڕۆژێك نەخۆشکەوت، داوای لە خێزانی کرد ماسی بۆ پەیدا بکەن، گەڕان تەنها یەك ماسییان دەستکەوت بۆیان چاککرد و هێنایان تا بیخوات، لەو کاتەدا هەژارێك هات، عبداللە ماسییەکەی دایە هەژارەکە، خێزانەکەشی گوتی: (سبحان اللە) تۆ ئەوەندە بە ئێمەت گوت، تا بۆمان پەیداکردی، ئێستاش شتی کەمان هەیە بیدەین بە هەژارەکە بۆ ماسییەکەت دایە؟

گوتی، چونکە عبداللە حەزی لەو ماسییە بو...

(واتە: مادام حەزم لێیەتی دەبێ بیبەخشم)، هەروەها لە کاتی نەخۆشییەکەشدا داوای ترێی کرد، هێشویەك ترێیان بۆ کڕی بە یەك درهەم،

---

١ـ رواه الشيخان.

٢ـ آل عمران/٩٢.

هێنایانەوە بۆ عبداللە، ئەمجارەش هەژارەکە ویستی بێتەوە، بەڵام نەیان هێڵا، ئەگەر عبداللە بەمەی زانیبا ئەو ترێیەی نەدەخوارد.

جوامێری عبداللە بە ڕادەیەك بو، هاوەڵانی دەڵێن: خواردنی نەدەخوارد، تاوەکو هەتیوێك لەسەر سفرەکەی بەشداری خواردنەکەی نەکردبایە.

کار بەو ڕادەیە گەیشت، کە عبداللە یان بە لاوازی دەبینی، لۆمەی خێزانەکەیان دەکرد و دەیانگوت: بۆچی خزمەتی ئەو پیرەمێردە ناکەی (واتە عبداللە)؟ ئەویش دەیگوت: من بڵێم چی هەر خواردنێکی بۆ دروستدەکەین، خێرا خەڵکی لێکۆدەکاتەوە و دەیانداتێ.

خێزانی دەڵێ: هەندێ هەژار هەبون لە کاتی گەڕانەوەی لە مزگەوت لە ڕێگەکەی دادەنیشتن و ئەویش لەگەڵ خۆی دەیهێنانەوە و خواردنەکەی دەدانێ، منیش ناردم بە شوێنیاندا و خواردنەکەم پێدان، پێم گوتن دوای نوێژ لەسەر ڕێگەی دامەنیشن، کاتێك کە عبداللە گەڕایەوە، گوتی: بنێرن بە شوێن فلان و فلان، کە خواردنم بۆ ئەوانیش ناردبو، پێم گوتن، ئەگەر ناردی بە شوێنتاندا مەیەن، بەڵام عبداللە بەمەی زانی و گوتی: ویستتان ئەمشەو نان نەخۆم! ئیدی ئەو شەوە نانی نەخوارد..!

جارێکیان عبداللە ویستی بچێتە دەر لە مەککە، بۆ گەشت، (ابن الصفوان) سفرەیەکی لە خواردنی جۆراوجۆری بۆ ڕازاندبۆوە و، ناردی بۆ عبداللە، کاتێك بۆیان هێنا، سەیری کرد و، دەستی کرد بە گریان و گوتی: (ما هكذا كنا!). واتە: کاتی خۆی ئێمە بەم شێوەیەمان نەکردوە، گوتی: من لەوەتەی موسڵمان بوم تێرم نەخواردوە، بۆیە فەرموی بیبەخشن بەسەر خەڵکی ئەم ناوەدا و فەرموی: تەنها خێر لەوەدایە، کە لای خوا پاداشتەکەی دەمێنێتەوە.

(عبداللە کوڕی عدی) لە عێراق هاتبۆوە، هاتە لای عبداللە و سەلامی کردو گوتی: دیارییەکم بۆ هێناوی، گوتی: چیە؟ گوتی: (جوارش)؟!، ئەویش گوتی: جوارش چیە؟! گوتی: خواردن هەرس دەکات، عبداللە گوتی: چل ساڵە سکم تێر خواردن نەکردوە ئیتر چی لەوە بکەم؟!

یەکێك لە کوڕەکانی عبدالله جلەکانی دڕابو، داوای لە باوکی کرد، تا جلێکی تازەی بۆ بکڕێت، عبدالله ش گوتی: جلەکانت پینە بکە و بیکەوە بەرت، کوڕەکەی ئەمەی پێناخۆش بو، عبدالله پێی گوت: (ویحك اتق الله ولا تکونن مع القوم الذین یجعلون ما رزقهم الله عزوجل في بطونهم وعلی ظهورهم). واتە: (هاوار بۆ خۆت، لە خوا بترسە و وەك ئەوانە مەبە، کە نیعمەتەکانی خوایان خستۆتە ورگیان و داویانە بە کۆڵیاندا) مەبەستی لە خواردن و جل و بەرگە.

لە هەمانکاتدا عبدالله پیاوێکی ئازا بوە بۆ کاروکاسبی، تەنانەت (نافع) دەگێڕێتەوە، کە عبدالله لە کەعبە لە سوجدەدا بو دەیگوت: (وقد تعلم ما یمنعني من مزاحمة قریش علی هذه الدنیا الا خوفك). مەبەستی لەسەرقاڵ نەبونیەتی بە کەسابەتەوە، هەرچییەکیشی دەست کەوتبێت یەکسەر بەخشیویەتی.

(میمونی کوڕی مهران) دەڵێت: (أتت ابن عمر اثنان و عشرون الف دینار في مجلس فلم یقم حتی فرقه). واتە: (لە یەك دانیشتندا بیست و دوو هەزار دیناریان هێنا بۆ عبدالله هەڵنەستا، هەتاوەکو هەموی بەخشییەوە)!.

لە بواری چاکە کردنیشدا (نافع) دەگێڕێتەوە، کە: (ما مات ابن عمر حتی اعتق الف انسان او زاد). واتە: عبدالله تا مرد زیاتر لە هەزار کۆیلەی ئازادکردوە، مەبەستی ئەوەیە کڕیویەتی و ئازادی کردوە.

لە بواری ڕۆح سوکی و خۆ بەکەم زانین (تواضع)دا هەرگیز چاوەڕێ نەبوە خەڵکی خزمەتی بکەن و ئەویش ئاغا بێت.

لەم بارەیەوە مجاهد فەرمویەتی: (صحبت ابن عمر وأنا ارید ان اخدمه فکان یخدمني اکثر). واتە: هاوڕێیەتی عبدالله م کرد بۆ ئەوەی خزمەتی بکەم، کەچی ئەو زیاتر خزمەتی منی دەکرد.

عبدالله خۆی دەگێڕێتەوە، کە : (أخذ رسول اللهﷺ بعض جسدي فقال: كن في الدنيا غريباً او عابر سبيل وعد نفسك من أهل القبور)[١].

واتە: پێغەمبەرﷺ گرتمی و پێی گوتم: (لە دونیادا وەك غەریبێك، یان وەك ڕێبوارێك بژی و خۆت بە یەكێك لە مردوی ناو گۆڕستان بژمێرە).

بۆیە دڵی نەدەدا بە هیچ نیعمەتێكی ئەم دنیایە و هەمیشە لە خەیاڵی قیامەتدا بوە، بە ڕاستی گەورەیی ئیسلام لەوەدایە، كە پیاوی ئاوا جوامێر پەروەردە دەكات، بۆ كۆمەڵگە ئەمە چ خێرێكە؟ چ بەرەكەتێكە؟ چ خزمەتێكە؟! كۆمەڵ، ئەگەر تەنها چەند پیاوێكی لەو بابەتەی هەبێ بۆ بەختەوەر نابێت؟ گەل چۆن هەژار دەبێت، چۆن برسی دەبێت، چۆن ئاوا رژد و دەست نوقاو دەبێت؟ ئەمە لە كوێ و چاوچنۆكی و تێر نەبونی خەڵكی ئەم وڵاتە لە كوێ؟ ئەمە لە كوێ و تاڵانكردنی سەروەت و سامان لە كوێ؟ ئەمە لە كوێ و دەستی سوربو بە خوێنی منداڵ و پیر و گەنجی میللەتێك لە كوێ؟! سەیر لەوە دایە ئەو كەسانەی بونەتە دایەن بۆ زوڵم و ستەم، پێیان ناخۆشە بە شوێنكەوتوی ئیسلامیان نەزانی و لە خانەی موسڵماناندا نەیان نوسی، بەڵكو ئەوانیش هەر خۆیان بە موسڵمان دەزانن.

## وانەی سێهەم: دایكی موسڵمانان ( ئوم سەلەمە )

باوكی گەورەیەك بو لە گەورەكانی مەخزومی، لەبەر نان بدەیی ناویان لێنابو توێشوی ڕێ (زاد الراكب)، چونكە ڕێبواران بەو هەرێمەی ئەو دەواری لێ هەڵدابو تێپەڕ بانایە نمەكی ئەویان دەكرد.

مێردیشی (عبدالله ی كوڕی عبدالأسد)، كە یەكێك بوو لە دە كەسەكەی پێشینەی ئیسلام، ئەبوبەكری صدیق و چەند كەسێكی كەم نەبێت، كە

---

١ـ أخرجه البخاري.

ژمارەیان لە پەنجەی دەست تێپەڕی نەدەکرد لە پێش ئەو ئیسلام نەبون.

ناوی (أم سلمة) (هیند) بوو ڕەزای خوای لێ بێت ، بەڵام ناسراو بوو بە (أم سلمة)، أم سلمة لەگەڵ مێردەکەی بونە موسڵمان، بۆیە ئەویش لە موسڵمانانی پێشین بوە ئەوەندەی نەبرد، دوای موسڵمان بونیان مێردەکەی و خۆشی کەوتنە ژێر ئازاری قوڕەیش و ئەشکەنجەیەکی بێ شوماریان دان، بەڵام ئەوان لە چیای سەرکەش خۆڕاگرتر بون، کاتێك کە ئێش و ئازاریان گەیشتە ڕادەیەك، کە چیدی بەرگەیان نەدەگرت، پێغەمبەرﷺ ماوەی دان بچنە حەبەشە، ئوم سەلەمە و مێردی لە ناو پێشەنگی کۆچکردواندا بون، ئوم سەلەمە و مێردی ڕویان لە غەریباتی کرد و لە مەککە جێی و ڕێی خۆش و گوزەرانی باشیان بەجێ هێشت، بە هیوای پاداشتی خوا و ڕەزامەندی خوا، هەرچەندە لە سایەی (نەجاشی) شای حەبەشە باڵی دادپەروەری بەسەریان کێشا بوو، خوای گەورە نەجاشی بە بەهەشت شاد بکات، لەگەڵ ئەوەشدا دڵیان هەر لە مەککە و لە لای پەیامبەری خوا بووﷺ..

پاشان هەواڵ گەیشت، کە موسڵمانان لە مەککە زیادبون و (حمزە و عمر) موسڵمان بون و بە موسڵمان بونی ئەوان موسڵمانان هێزیان زیادیکردبو، چیدی قوڕەیش وەك جاران نەیان دەتوانی ئازاری موسڵمانان بدەن، بۆیە دەستەیەك لە موسڵمانان بە پەرۆشەوە کەوتنە خولیای گەڕانەوە بۆ مەککە بەوپەڕی شەوق و خۆشەویستییەوە، أم سلمە و مێردی لە پێشەنگی گەڕاوەکاندا بون، بەڵام ئەوەندەی پێ نەچو گەڕاوەکان بۆیان دەرکەوت، کە ئەو هەواڵانەی پێیان گەیشتبو زیادەڕۆی تێدا کرابو، ئەو ڕاپەڕینەی موسڵمانان دوای موسڵمانی بونی (حمزە و عمر) لە لایەن قوڕەیشەوە بە هێرشێکی گەورەتر بەرپەچ درایەوە...

موشریکەکان (هاوەڵ بۆ خوا پەیداکەرەکان) زیاتر ئازار و ئەشکەنجەی موسڵمانانیان دەدا و لە پێشتر زیاتر دڕندایەتیان بەرامبەر دەنواند، ئەو کاتە پێغەمبەرﷺ ڕێگەی پێدان کۆچ بکەن بۆ مەدینە (ام سلمە و مێردەکەی) بونە هەوەڵ کۆچکردو تاوەکو دینەکەی خۆیان ڕزگار بکەن و لە ئەشکەنجەی

قورەیشیان رزگاریان ببێ.

بەلاّم کۆچی أم سلمە و مێردی وەك خۆیان خەیاڵیان دەکرد ئاسان نەبو بەڵکو زۆر زەحمەت و دژوار بو کە مەرگەساتێکی لێ پەیدا بو.

با لە (أم سلمە) گەرێین خۆی مەرگەساتەکەمان بۆ بگێرێتەوە، چونکە هەست کردنی ئەو بەو مەرگەساتە قوڵتر و وردترە.

ـ أم سلمە گوتی: کاتێك أبو سلمە برپاری کۆچکردنی بۆ مەدینە دا حوشترێکی بۆ ئامادە کردبوم و سواری کردم و سەلەمەی منداڵم خستمە کۆشمەوە و ئەویش وشترەکەی گرتبو بە دەستەوە و ئاوڕی لە هیچ نەدەدایەوە، پێش ئەوەی لە مەککە دەربچین چەند زەلامێکی مەخزومی تیرەی من ئێمەیان دی، رێیان لێگرتین و بە ئەبو سەلەمەیان گوت: ئەگەر تۆ سواری ملی خۆت بوی، چ هەقێکت بەسەر ئەم ژنەتەوە هەیە؟! کە کچی ئێمەیە، جا چۆن لێ دەگەرێین لێمان بستێنی و بیبەیە شارەکی!.

ـ ئینجا پەلاماری یەکتریان دا و منیان بە تۆبزی لێ ستاندەوە، هەر کە خزمانی مێردم (بنو سعید الأسد) ئەمانیان دیت من و منداڵەکەم دەبەنەوە لای خۆیان، تا ئەوپەری تورە بون و گوتیان: نا بە خوای منداڵ لای ژنی ئێوە بەجێ ناهێڵین و دوای ئەوەی بە زۆری لە پیاوی ئێمەتان ستاندوە...کوڕ کوڕی ئێمەیە و ئێمە ئەولاترین پێی...

ئینجا یەك لەوان و یەك لەمان، سەلەمەی کوڕمیان پەلەکێش کرد و لە بەینی خۆیان لەبەر چاوی من تا قۆڵیان لە دەستی یەکتری هێنایە دەرەوە و بردیانە لای خۆیان!

لە چەند چاو تروکانێکدا من خۆم ماڵ وێران و تاق و تەنیا دیتەوە..

مێردەکەم لە ترسی سەروبەینی ڕوی لە مەدینە کرد..

منداڵەکەشمیان بە شکستە باڵی لە من سەندەوە (بنو سعید عبدالأسد) لە یەك ساتدا لە ماڵ و مێرد و منداڵیان کردم، لەو ڕۆژەوە هەمو ڕۆژێك بەیانیان

دەچومە (إبطح) لەو شوێنەی ئەو کارەساتەم بەسەرهات، دادەنیشتم و دیمەنی ئەو ساتە وەختانەم دەهێنایەوە پێش چاوی خۆم، کە لە نێوان من و منداڵەکەم و مێردەکەمدا کردیان، تا ئێوارە وەختان هەر دەگریام.

ـ تا ساڵێك یان نزیك ساڵە وەختێك بەو حاڵە مامەوە، تا ڕۆژێك پیاوێك لە خزمەکانی خۆم بە تەنیشتمدا تێپەڕی و دڵی پێم سوتا و بەزەیی پێمدا هاتەوە و بە کەس و کارمی گوت: بۆچی ئەو بەستەزمانە بەرەڵلا ناکەن! خۆی و مێردەکەی و منداڵەکەیتان لە یەکتری کردون، ئیتر لەگەڵیان خەریك بو سۆز و بەزەییانی دەجۆشاند، تاوەکو پێیانگوتم: دەبڕۆوە بۆ لای مێردەکەت، ئەگەر دەتەوێت، بەڵام بچمەوە لای مێردەکەم لە مەدینە و منداڵەکەشم لە مەککە لە لای (بنت عبدالأسد) بەجێ بهێڵم؟! چۆن دەکرێت ئارام بگرم و منداڵە بچکۆلەکەشم لە مەککە بێت، چی دەزانم دەربارەی؟!

ئینجا خەڵکانێك بە ئێش و ئازاری منیان زانی و دڵیان پێم سوتا و قسەیان لەگەڵ (بني عبدالأسد) کرد لە بارەی منەوە و سۆزی ئەوانیان خستە جوڵە و ئەوانیش سەلەمەی کوڕمیان دامەوە.

لە مەککە نەم دەویست خۆم ڕاگیربکەم، تا هاوڕێیەك پەیدا بکەم، چونکە دەترسام شتێك، کە لە خەیاڵمدا نەبو ڕوی دابایە و ڕێگەی لێ بگیرێ بگەمە مێردەکەم، بۆیە وشترەکەم ئامادەکرد و کوڕەکەم لە کۆشی خۆم دانا...دەرچوم بەرەو مەدینە دوا بە دوای مێردەکەم و کەس لە بەندەی خوا لەگەڵم نەبو، هەر کە گەیشتمە (تەنعیم) شوێنێکە سێ میل لە مەککەوە دورە بە عوسمانی کوڕی طلحة گەیشتم، پێیگوتم: بۆ کوێ ئەی کچی توێشوی ڕێبوار؟!

منیش گوتم: دەمەوێ بچم بۆ لای مێردەکەم لە مەدینە.

گوتی: کەس لەگەڵت نییە؟!

گوتم: نەوەڵڵا تەنها خوای گەورە و ئەو کوڕەم نەبێت.

گوتی: قەسەم بە خوا قەت جێت ناهێڵم، تا دەگەیتە مەدینە.

ئینجا جڵەوی وشتەرەکەی گرت و بە پێشم کەوت...

سوێند بە خوا قەت پیاوێکی عەرەبی لەو دڵ فراوانتر و ڕەوشت جوانترم نەدی هاوڕێیەتیم بکات، کاتێك دەگەیشتە قۆناغێك وشترەکەی (یخ) دەکرد و لێم دوردەکەوتەوە، تا دەهاتمە خوارەوە لە پشتی وشترەکە و دەهاتمە سەر زەوی، ئینجا لێم نزیك دەکەوتەوە و پشتی وشترەکەی دەکردەوە و دەیبرد لە دارێك دەیبەستەوە.

ئینجا خۆی لە من وندەکرد و دەچو لە سێبەری دارێکی تر پاڵی دەدایەوە.

کاتێك دەمانویست قۆناغ جێ بهێڵین هەڵدەستا و وشترەکەی بۆ ئامادە دەکردمەوە و دەیهێنایە پێشم و خۆی دور دەخستەوە و دەیگوت: سواربە، کە سوار دەبوم و لەسەر پشتی وشترەکە جێگیر دەبوم دەهاتەوە جڵەوی وشترەکەی دەگرتەوە و دەستی بە ڕۆیشتن دەکرد..

ئیدی هەمو ڕۆژێك وای دەکرد تاوەکو گەیشتینە مەدینە، کاتێك تەماشای گوندێکی کرد، نزیك قوباء (قباء) دەوروبەری مەدینە، دوو میل لێیەوە دوورە، کە هی (بەنو عەمری کوڕی عوف) بو، گوتی مێردەکەم لەم گوندەیە، دەبڕۆ بەرەکەتی خوا بەسەرت دابڕژێ، پاشان بەرەو دوا گەڕایەوە بۆ مەککە..

بەم جۆرە دوای لە یەکتر دابڕانێکی زۆر و درێژ خایەن بە یەکتری شاد بونەوە و چاوی أم سەلەمە بە مێردەکەی ڕون بوەوە و ئەبو سەلەمە بە خێزانەکەی و منداڵەکەی شاد بونەوە، پاشان ڕوداوەکان خێرا خێرا بە چاوتروکان گوزەریان کرد...

ئەوەتا جەنگی بەدر هات، ئەبو سەلەمە بەشداری تێدا کرد و دوای سەرکەوتنێکی دیار لەگەڵ موسڵمانان گەڕایەوە، دوای ئەوەش جەنگی ئوحود ڕویدا، ئەبو سەلەمە بەشداری لەمەشیاندا کرد و بە جوانترین شێوە ئەم تاقی کردنەوەیەی ئەنجام دا، بەڵام بە برینێکی سەختەوە لێی هاتە دەرەوە، بەردەوام بو لە تیمار کردنی تاوەکو وای زانی برینەکەی سارێژ بۆتەوە، لە کاتێکدا برینەکەی تەنها لە ڕوی سەرەوە سارێژ بو بوەوە، بەڵام لە دیوی ناوەوە

هەڵی دابویەوە، ئەوەندەی نەبرد بریندار بوەوە ئەبو سەلەمە ناچار لە جێگەدا کەوت.

لە کاتێکدا ئەبو سەلەمە کە برینەکەی تیمار دەکرا بە ژنەکەی گوت: ئەی ئوم سەلەمە، گوێم لە پێغەمبەری خوا بوﷺ دەیفەرمو: (لا يصيب أحداً مصيبة فيسترجع عند ذلك ويقول: اللهم عندك إحتسب مصيبتي هذه، اللهم أخلفني خيراً منها إلاّ أعطاه الله عزوجل).

ئەبو سەلەمە چەند ڕۆژێك لەسەر جێگە نەخۆش کەوت، سبەینەیەك پێغەمبەرﷺ تەشریفی هاتە سەردانی، ئەوەندەی نەبرد دوای تەشریف هێنانی پێغەمبەرﷺ هەر لە دەرگا دەرچو ئەبوسەلەمە ماڵئاوایی لە ژیان کرد، ئینجا پێغەمبەرﷺ بە هەردوو دەستی پیرۆزی دوو چاوی هاوەڵەکەی نوقاند و چاوی بۆ ئاسمان هەڵبڕی و فەرموی: (خوایە لە ئەبو سەلەمە خۆش ببە و پلەی لە نێوان موقەڕەبین دا بڵند بکە، خۆت لەباتی ماڵ و منداڵی جێی بگرەوە، لە ئێمەیش و لە ئەویش خۆش ببە ئەی پەروەردگار و بەخێوکەر و تەربیەدەری هەمو عالەم، قەبری بۆ فراوان بکە و ڕوناکی بکەرەوە).

ئوم سەلەمە فەرمودەکەی ئەبو سەلەمەی بیر دەکەوتەوە، کە پێغەمبەرﷺ فەرموبوی، دەیگوت (خوایە بە ئومێدم پاداشتی ئەو بەڵایە لای تۆ وەربگرمەوە، دەڵێ دڵی بەرایی نەدەدا بڵێ: خوایە لە پاداشتی بەڵایەکەم، چاکەیەکی چاکترم لەگەڵ بکەی، چونکە پرسیاری دەکرد، کێ باشتر هەیە لە ئەبو سەلەمە؟!

بەڵام هەرچۆنێك بێت نزایەکەی تەواو کرد و پاشان پێغەمبەری خواﷺ چوە داخوازی و ئەویش پێی گوت: (ئەی پێغەمبەری خواﷺ من سێ ڕەوشتم هەن ژنێکم غیرەتی زۆر لەسەر مێردم دەکەم، جا دەترسم غیرەت لەسەر جەنابت بکەم و تۆیش لێم تورە ببیت و خواش بەهۆی ئەمەوە عەزابم بدات، هەروەها من ژنێکم بەساڵدا چوم و خاوەنی کۆشێك منداڵم).

پێغەمبەریشﷺ فەرموی: (سەبارەت بە غیرەتت لە خوا دەپاڕێمەوە، ئەو ڕەوشتەت نەهێڵێت، سەبارەت بە تەمەنیشت منیش وەکو تۆ بە ساڵدا چوم، سەبارەت بە منداڵەکانیشت، منداڵی تۆ منداڵی منن، پاشان پێغەمبەری خواﷺ ئوم سەلەمەی گواستەوە، خوای گەورەش نزای ئوم سەلەمەی گیرا کرد و یەکێکی لە ئەبو سەلەمەی چاکتر پێ بەخشی، لەو ڕۆژەوە هیندی مەخزومی بە تەنیا بە دایکی سەلەمەوە نەمایەوە بەڵکو بو بە دایکی هەمو ئیمانداران.

خوای گەورە ڕوی ئوم سەلەمە لە بەهەشت سپی بکات و لێی خۆش بێت و لێی ڕازی بێت...

## وانەی چوارەم: عومەری کوڕی عبدالعزیز

(سفياني ثوري) دەفەرموێت: خەلیفەی ڕاشدین پێنجن: (ابوبکر و عمر و عثمان و علی و عمری کوڕی عبدالعزیز) ڕەزای خوایان لێ بێت. عمری کوڕی عبدالعزیز کوڕی مەروانە، کە برای عبدالملك کوڕی مەروانە، دایکیشی کچی (عاصم)ە واتە: کوڕەزای (عمری کوڕی خطاب)ە.

لە یەکێك لەو شەوانەدا، کە عمری کوڕی خطاب دەگەڕا بە ناو شاردا گوێی لێ بو ژنێك بە کچەکەی دەڵێت: هەستە ئاو بکەرە ناو شیرەکە، کچەکەی بە دایکی دەڵێت: ئەی گوێت لێ نەبو گەورەی موسڵمانان فەرمانی داوە کەس ئاو تێکەڵی شیر نەکات؟ دایکەکەش دەڵێت: خۆ ئێستا گەورەی موسڵمانان چاوی لێمان نییە و پێمان نازانێت، کە ئێمە ئەو کارە ئەنجام دەدەین، کچەکەش دەڵێت: سبحان الله، ئەگەر گەورەی موسڵمانانیش نەمان بینێت خۆ خوای گەورە دەمان بینێت، ئەو هەڵوێستەی ئەو کچە زۆر کار لە عمر دەکات، بۆیە ماڵەکە دەست نیشاندەکات و دەگەڕێتەوە ماڵەوە بە کوڕەکانی دەڵێت: کێ لە ئێوە ئارەزووی ژن هێنانی هەیە؟

(عاصم) دەڵێت: من، عومەریش دەچێت ژنی ئەو شیرفرۆشەی لێ مارەدەکات، چونکە دەزانێت ئەم جۆرە ئافرەتانە شایانی ئەوەن، کە نەوەی بەسودیان لێ بکەوێتەوە، ئەوە بوو لە نەوەی ئەو کچە عومەری کوڕی عبدالعزیز کەوتەوە، چونکە کاتێك، کە عبدالعزیز کوڕی مەروان ویستی ژن بهێنێ، بەسەر کارەکەی گوت (٤٠٠) چوار سەد درهەمم (دینارم) لە پاکترینی پارەکانم بۆ کۆ بکەوە دەمەوێت ژن بهێنم، ئەوە بو کچی (عاصم)ی کوڕی عمری کوڕی خەتتابی مارە کرد، کە دایکی عومەری کوڕی عبدالعزیزە، واتە دایکی عومەری کوڕی عبدالعزیز، کچە زای ئەو کچەیە، کە رازی نەبو ئاو تێکەڵ بە شیرەکە بکات.

(ذُرِّيَّةً بَعْضُهَا مِنْ بَعْضٍ)....الآية.

(ئەحمەدی کوڕی حەنبەل) دەڵێت: لە فەرمودەی پێغەمبەرداﷺ هاتوە، کە لەسەری هەمو سەد ساڵێکدا یەکێك دەنێرێ بۆ ئەم ئوممەتە، کە دینەکەی بۆ ڕاستبکاتەوە سەیرمان کرد لە سەدەی یەکەمدا عومەری کوڕی عبدالعزیز بوە، لە سەدەی دووەمیشدا شافعی بوە، کاتێك سلێمانی کوڕی عبدالملك وەفاتیکرد، عومەری کوڕی عبدالعزیز دەفنی کرد، پاش تەواو بونی لە دەفنکردنی کەژاوەی خەلیفایەتییان لە عومەر هێنایە پێشەوە و فەرموی سەرکەوتنیان لێکرد، گوتی: ئەمە چییە؟ گوتیان: کەژاوەی خیلافەتە بۆ تۆمان هێناوە، تا سەرکەویت، ئەویش گوتی: من ئەمەم بۆچییە؟ لای بەن دوری بخەنەوە لێم، وەڵاخەکەی خۆم بۆ بهێنن کاتێ سواری بوو، پاسەوانەکانی خەلیفە بە ڕمەوە بەم لاولایدا بەڕێکەوتن، ئەویش فەرموی: دورکەونەوە لێم ئێوەم بۆچییە؟ من تەنها کەسێکم لە موسڵمانان. ڕۆیشت، تا گەیشتە مزگەوت و خەڵکیش لەگەڵیدا هاتنە مزگەوت، سەرکەوتە سەر مینبەر و خەڵکیش لێی کۆبونەوە و گوتی:

ئەی خەڵکینە! منتان توشی ئەو ئەرکە کردوە بە بێ ئەوەی من خۆم ڕازی بم، یان داوام لێکرا بێ، یان پرسم پێ کرابێت ئەوا ئەو بەیعەتەی داوتانە بە من، من لە گەردنی خۆمی دادەماڵم و لێی دەردەچم بۆ خۆتان، یەکێکی تر هەڵبژێرن، موسڵمانانیش هەمویان بە یەك دەنگ هاواریانکرد: ئەی گەورەی

موسڵمانان ئێمە تۆمان هەڵبژارد و بە تۆ ڕازین و، بە پشتیوانی خوا کاروبارمان بگرە دەست، لەسەر خێر و بەرەکەت.

کاتێك دیتی خەڵکەکە لێی بێ دەنگ بون و هەمویان بەو ڕازین، حەمد و سەنای خوای کرد و سڵاواتی لەسەر پێغەمبەرﷺداو گوتی:

ئامۆژگاریتان دەکەم بەوەی لە خوا بترسن، چونکە لە خواترسان لە هەمو شت گرنگترە و هیچ شتێك نییە لەوە گرنگتر بێ، هەوڵ بۆ قیامەتتان بدەن، چونکە هەر کەس هەوڵ بۆ قیامەت بدات خوای گەورە ژیانی دونیای بۆ ئاسان دەکات، پەنهانتان چاك بکەن و خوای گەورە ئاشکراتان چاك دەکات، زۆر یادی مردن بکەن و چاك خۆتانی بۆ ئامادە بکەن، چونکە مردن ڕوخێنەری ئارەزوەکانە...ئەم ئوممەتە نە جیاوازی لە خواکەیدا هەیە و جیاوازی لە خواکەیدا هەیە و نە لە پێغەمبەرەکەی و نە لە قورئانەکەشیدا...بەڵکو ناکۆکی و جیاوازییتان لەسەر دینار و درهەمە، سوێند بە خوا منیش بە نارەوا هیچ نادەم بە کەس و ماف کەسیش نافەوتێنم...

پاشان دەنگی هەڵبڕی و هاواری کرد:

خەڵکینە! هەرکەس گوێڕایەڵی فەرمانی خوای گەورە بوو، پێویستە گوێڕایەڵی بکرێت، هەر کەس سەرپێچی فەرمانی خوای کرد، گوێی بۆ ناگیرێ، بە گوێم بکەن، تا ئەو کاتەی ملکەچی فەرمانی خوا بوم، هەر کاتێك سەرپێچیم کرد هیچ گوێڕایەڵییەکتان لەسەر نییە بۆ من..

پاشان دابەزی و چوە ژوورەوە فەرمانی کرد ئەو پەردە و پۆشاکانەی ڕازێنرابونەوە، لابران و فرۆشران و پارەکەی خرایە (بيت المال)ی خیلافەتەوە.

پاشان ویستی سەرخەوێك بشکێنێ، عبدالملکی کوڕی هات و گوتی:

ئەی گەورەی موسڵمانان ئەوە خەریکی چی؟! گوتی کوڕم سەرخەوێك دەشکێنم. گوتی: دەخەوی و داوای خەڵکی جێبەجێ ناکەی؟! گوتی: کوڕم من

دوێنێ شەو خەریکی بە خاك سپاردنی مامت (سلیمان) بوم، با ....دوای نیوەڕۆ دەچم بە دەم داواکاری خەڵکەوە...

گوتی: گەورەی موسڵمانان کێ دەزانێ تا نیوەڕۆ تۆ دەمێنی ؟!

گوتی: کوڕم وەرە پێشەوە ، لێی نزیك بوەو، باوەشی پێدا کرد و گوشی بە خۆیەوە و نێوچاوانی ماچ کرد و گوتی: (الحمد لله الذي أخرج من صلبي من يعينني على ديني): سوپاس بۆ ئەو خوایەی، کە لە نەوەی خۆم کەسێکی پێ بەخشیوم یارمەتیم دەدات لە دینەکەمدا..

وازی لە نوستنەکە هێنا و چوە دەرەوە و فەرمانی دا، کە جاڕچی هاوار بکات، کێ داواکاری هەیە، بەرزی بکاتەوە.

کابرایەکی (ذمي) واتە: (ئەهلی کیتاب کە لە ژێر سایەی دەوڵەتی ئیسلامیدا دەژیان) خەڵکی (حمص) بو هاتە لای سەروڕیشی سپی بو، گوتی: گەورەی موسڵمانان داوای پەڕاوی خوات لێدەکەم، (جێبەجێ کردنی فەرمانی خوا)، گوتی چییە؟ گوتی: عباسی کوڕی وەلید کوڕی عبدالمليك زەویەکەمی داگیر کردوە، (عباسیش دانیشتبو) پێی گوت: ئەی عباس تۆ دەڵێی: چی؟ گوتی: وەلیدی کوڕی عبدالملك بۆی بڕیومەوە و نامەی بۆ نوسیوم.

عمر گوتی: ئەی (ذمي) تۆ چی دەڵێی؟

گوتی: ئەی گەورەی موسڵمانان داوای پەڕاوی خوات لێدەکەم.

عمر گوتی: پەڕاوی خوا شایانی پەیڕەوی کردنە نەك نامەی وەلیدی کوڕی عبدالملك، هەستە ئەی عباس زەوییەکەی بۆ بگێڕەوە، ئەویش بۆی گێڕایەوە، کاتێك لە بە خاك سپاردنی (سلیمان) گەڕایەوە، هەندێ کەس پێیان گوت: ئەوە بۆچی ئاوا غەمباری؟!

بۆ حاڵێکی ئاوا غەمباری پێویستە، یەك بە یەکی ئوممەتی (محمد)ﷺ لە ڕۆژهەڵاتەوە، تا ڕۆژئاوا مافی خۆی بدەمێ بە بێ ئەوەی داوام لێبکات، یان ئاگادارم بکات لە بارەیەوە.

مالیکی کوڕی دینار دەڵێت: کاتێك عومەری کوڕی عبدالعزیز کرایە خەلیفە شوانەکان بەسەر چیاکانەوە گوتیان: ئەو پیاو چاکە کێیە بوە بە خەلیفە؟!
لێیان پرسین دەی ئێوە لە کوێ دەزانن؟! گوتیان ئەگەر پیاو چاك بکرێتە خەلیفە گورگ دەست لە مەڕومالاتەکەمان هەڵدەگرێت...

(رجاء بن حیوة) دەڵێت: عومەری کوڕی عبدالعزیز پێش ئەوەی بکرێتە خەلیفە لە هەمو کەس پۆشتەتر و بۆن خۆشتر و فیزی زیاتر بو لە کاتی ڕۆیشتندا، بەلام کاتێك کرابو بە خەلیفە هەمو جل و بەرگەکانی هەڵسەنگێنرا بو بە دوازدە درهەم بە کلاوو عەمامە و کراس و عەبا و هەمو جل و بەرگەکانییەوە. (محمدی کوڕی کعب) دەڵێت: کابرایەك جبەیەکی هێنا بۆ عمر تا پێی بفرۆشێت، عومەریش لێی کڕی بە هەشت درهەم و، گوتی عەیبی نییە تەنها ئەوەندە نەبێ کەمێك شل و خاوە، منیش پێکەنیم، عومەر گوتی: بۆچی پێدەکەنی؟! گوتم، چونکە کاتی خۆی تۆم دیتوە جبەکەت بایی (٨٠٠) هەشت سەد درهەم بوە!!

(یونس بن أبي شبیب) دەڵێت: عومەرم بینی لە کاتی دەورە کردنیدا (دەورە کردنی بەیت) پشتێنەکەی لە چرچی ورگیدا ون ببو، پاش ئەوەی کرا بە خەلیفە دیتمەوە، ئەگەر ویستبام پەراسوەکانی بژمێرم بە بێ ئەوەی دەستی لێبدەم دەمتوانی.

(مسلمةی کوڕی عبدالملك) دەڵێت: لە کاتی نەخۆشیدا سەردانی عومەری کوڕی عبدالعزیزم کرد، کراسێکی چڵکنی لەبەردا بو، بە (فاطمةی کچی عبدالملك)م گوت: ئەی فاطمة کراسی خەلیفەی موسڵمانان بشۆرە، گوتی: إن شاء الله دەیشۆین، پاشان گەڕامەوە دیتم کراسەکە وەك خۆیەتی و نەشۆراوە، گوتم: ئەی فاطمة نەم گوت: ئەو کراسەی خەلیفەی موسڵمانان بشۆرن خەڵکی سەردانی دەکات؟ گوتی: سوێند بە خوا غەیری ئەو کراسەی کراسی دی نییە!

(فهر) لە باوكیەوە دەگێڕێتەوە، كە (عومەری كوڕی عبدالعزیز) سێوی (فئ) دەستكەوتی دابەشكرد بەسەر موسڵماناندا، كوڕێكی بچوكی سێوێكی گرت بە دەمەوە ئەمیش لە دەمی ڕاتەكاندەوە و ئازاری پێ گەیاند، ئەویش بە گریانەوە گەڕایەوە بۆ لای دایكی، دایكیشی ناردی لە بازاڕ سێوی بۆ كڕی، كاتێ (عومەر) گەڕایەوە بۆنی سێوی كرد لەماڵەوە، گوتی: ئەی فاطمة هیچ سێوت هێناوەتەوە لەو سێوی غەنیمەتە؟

گوتی: نەخێر، بەسەرهاتەكەی بۆ گێڕایەوە، ئەویش گوتی: سوێند بە خوا پێم ناخۆش بو پاداشتی قیامەتی خۆم بسوتێنم بۆ سێوێكی دەستكەوتی موسڵمانان.

ئافرەتێك چوە ماڵی عومەر كاتێك ماڵەكەی دیت بەو شێوەیە سەری سوڕما و گوتی: ئەمەیە ئەو ماڵەی كە من بەتەما بوم ماڵەكەی خۆمی پێ ئاوەدان بكەمەوە؟ كچەكەی وەڵامی دایەوە و گوتی: ئاوەدان كردنەوەی ماڵانی وەك ئێوە ئەم ماڵەی ئاوا وێران كرد، عومەر گوتی: والی ئەگەر لاواز بێت ڕەعیەتەكەی قەڵەو دەبن، بەڵام ئەگەر والی قەڵەو بێت ڕەعیەتەكەی لاواز دەبێت.

هەروەها ئافرەتێك چوە لای عومەر و گوتی: پێنج كچم هەیە تەمەنیان بەسەر چوە و شویان نەكردوە و لای خۆم ماونەتەوە، عومەر دەستی كرد بە گریان و فەرمانی دا، كە چییان پێویستە بۆیان دابین بكەن و بیان دەنێ، هەریەكەیان پێویستی خۆی درایە و ئەوانیش سوپاسی خوایان كرد و گوتیان (الحمد لله) تا پێنجەم، بەڵام پێنجەم گوتی (شكرا لك) ـ سوپاست دەكەم ـ ، عومەر گوتی: بۆیە دەتدەمێ تا سوپاسی خوا بكەی، بەڵام تۆ سوپاسی من دەكەی، لەبەرئەوە من هیچم نییە بتدەمێ و هیچی نەدایە و گوتی: بە خوشكەكانت بڵێ: ئەوان بەشت بدەن..

تەنانەت عومەر ڕازی نەبوە دیاریش (هدیة) وەربگرێ، پێیان گوت: پێغەمبەرﷺ وەری دەگرت، ئەدی تۆ بۆ وەری ناگری؟ دەیفەرمو: بۆ ئەو

دیارییە، بەڵام بۆ ئێمە بەرتیل (رشوة)یە، ڕۆژێکیان لە خزمەتکارەکەی پرسییەوە: حاڵی خەڵك چۆنە؟! ئەویش گوتی: هەموویان باشن، تەنها تۆ و من نەبێت، گوتی: دەبڕۆ تۆش ئازاد بە لە ڕایی خوا..

عومەر زۆر ڕێزی لە زانایان دەگرت، ڕۆژێك ناردی بۆ لای (سعید بن المسیب)، پرسیاری مەسەلەیەکی شەرعی لێبکات، نێرراوەکە بە هەڵە وای گەیاند بە (سعید)، کە خەلیفەی موسڵمانان بانگت دەکات بچیت بۆ لای، سعیدیش هات بۆ لای عومەر (بە مەرجێك هەرگیز نەدەچو بۆ لای کەس) کاتێك هاتە ژورەوە عومەر داچڵەکی و گوتی: سوێند بە خوا من نەمگوتوە تۆ بێیت و دەبێ بگەڕێیتەوە من دێمە خزمەتت، بۆ پرسیارەکەم، گەڕاندییەوە ئەمجارە خۆی ڕۆیشت بۆ لای و پرسیارەکەی لێکرد.

کاتێك عومەر نەخۆشی پێش مردنی بو، هەندێك لە دەست و پێوەندەکانی گلەیی ئەوەیان لێدەکرد کە تۆ ماڵ و منداڵەکەی خۆت هەژار کردوە و بێ بەشت کردوون لەو سامانەی بەردەستت، بەڵکو وەسیەت بکەی کە پاش خۆت هەندێکیان بدرێتێ.

عومەر لە جێگادا کەوتبو گوتی: راستم کەنەوە لە جێگاکەدا، پاشان گوتی: ئەوەی، کە دەڵێ: منداڵەکانم هەژار کردوە، من هیچ مافێکی خۆیانم لێ نەگرتونەتەوەو شتێکیش ئی ئەوان نەبێ نەمداونەتێ، ئەوەش کە دەڵێی: وەسیەتیان بۆ بکەم، ماڵیان بدرێتێ؟ من وەسیەت بۆ خوا دەکەم و دەیان سپێرم بەو خوایەی قورئانی ناردووە و سەرپەرشتی پیاوچاکان دەکات، کوڕی من یەکێك لەو دوو حاڵەتەن، یان ئەوەتا لە خواترسن، ئەو کاتە خوای گەورە دەروی خێریان لێدەکاتەوە، یان ئەوەتا سەرپێچی کەرن، من ئامادە نیم یارمەتییان بدەم لەسەر تاوان، کوڕەکانی بانگکرد و هەندێك قسەی بۆ کردن، پاشان گوتی: کوڕە شیرینەکانم باوکتان لە نێوان دوو ڕێگەدایە، یان ئەوەتا ئێوە دەوڵەمەند بن و باوکتان بچێتە دۆزەخ، یان ئێوە هەژار بن و باوکتان بچێتە

بەهەشت، باوکتان ئەمەیانی هەڵبـژاردووە، کە ئێـوە هـەزار بـن و خـۆی بچێتە بەهەشت، هەستن خوا بتانپارێزێت.

کاتێکیش مرد لەسەرەمەرگدا دەیگوت: ئەی پـەروەردگار مـن ئـەوەم، کـە تـۆ فەرمانت پێ کردوم و من سەرپێچیم کرد کەمتەرخەمیم کرد، بەڵام (لا إلـه إلاّ الله).

پاشان سەری هـەڵبڕی و چاوی بـە نزمـی دەیروانـی، گوتیـان ئـەوە تەماشـای چی دەکەی؟ فەرموی هەندێك لە ئامادەبوان دەبینم کە نەئادەمین و نە جـنین (واتە مەلائیکەن) پاشان ڕۆحی بە خوای گەورە سپارد..

ئەمە چەند گۆشەیەکە لە ژیانی ئەو خەلیفەیە بـەڕێزە، تـەنها ورد بونـەوە و هەڵوێستەکانی دەیخاتە ڕو کـە بەرپرسـیارێکی ڕاسـتەقینە چۆنە، ئەوکاتـەش دەردەکەوێت کـە نەگبـەتی خـەڵکی ئـەم زەمانـە لـە چ دایـە، چونکە بـە ڕاسـتی بەختیاری و بەختەوەری گـەل و نەتـەوە لەوەدایـە کاربەدەسـت لێپرسـراوی لـە خـوا تـرس و دڵسـۆزی هـەبێت، خـۆی بسـوتێ و خـەڵکی بحەوێتـەوە نـەك بـە پێچەوانە، خەڵکی بکاتە سوتەمەنی لە پێناو حەوانـەی خۆیـدا، هـەر لـە ژیـانی ئەم کەڵە پیاوە دەردەکەوێ، کە ئیسلام ڕاستە ڕەحمەتە بۆ گشت جیهان، بـەڵام ڕەحمەتەکەی وەختێك بەرجەستە دەبێت، کە بکرێتە واقیع و فـەرمان ڕەوایـی بچەسـپێنێت، نـەك وەك هەنـدێك کـەوا دەزانـن و ڕادەگەیـەنن بـە خـەڵکی، کـە ئیسلام و فەرمانڕەوایی کوجا مەرحەبا، خەڵکی ئەم زەمانەش ناهـەقیان نییـە، چونکە نەیاندیوە بە خۆیانەوە، حوکمی ڕاستەقینەی ئیسلامی، تـا بـزانن ژیـان لە ژێر هەر سایەیەکی کەدا داماوی و ماڵ وێرانییە،

هەروەها با بەرپرسانی کاری ئیسلامی لە خـوا بترسـن و بـزانن، ئەگـەر وەك (عومـەری کـوڕی عبـدالعزیز) نەبنـە نمونـەی بـەرزی تـەقوا و خواناسـی ئـەوا بێگومان بونەتە نمونەی ناشیرینی و قـەڵبی و دەسـت بـڕی و دنیـا خـواردن بـە ناوی دینەوە و، ئەوکاتەش دەبنـە سەرلێشواو و سەرلێشـێوێنەر (ضـال و مضـل) مەگـەر خـوا خۆیشـی بزانێـت ناشـیرینکردنی ئیسـلام و لەبەرچـاو خسـتنی چ

تاوانێکە، چەند زنجیرەیەکی بێ کۆتاییە لە گوناه، چونکە تا ڕۆژی قیامەت، چەند کەس بەهۆی ئەوانەوە لە دین دوور دەکەونەوە و هەر ئەوان تاوانبارن.

## وانەی پێنجەم: محمدی کوڕی سیرین

پاش ئەوەی سیرین لە لایەن (انس کوڕی مالك)ەوە لە کۆیلەیەتی ئازاد کرا، ویستی نیوەی دینەکەی تەواو بکات و ژن بهێنێت، ئەو ئافرەتەی کە پەسەندی کرد کەنیزەکێك بو لای ئەمیری موسڵمانان (ابوبکر الصدیق) و ناوی (صفیە) ئافرەتێکی گەنجی پێکەوتوی پێگەیشتو بو، پاش لێکۆڵینەوەی ئەمیری موسڵمانان لە داواکەی سیرین، ڕازی بو بە مارەکردنی صفیە لە سیرین، لە گواستنەوەکەیدا ئاهەنگێکی بۆ گێڕا بۆ کەم ژن کرا بێت لەو سەردەمەدا، ژمارەیەکی زۆر لە هاوەڵانی پێغەمبەرﷺ کە (١٨)یان ئەهلی بەدر بون ئامادەی ئاهەنگەکە بو بون، کاتبی وەحی پێغەمبەرﷺ (ابی بن کعب) دوعای بۆ کردوو هاوەڵانیش (آمین)یان بۆ دەکرد.

لە کاتی گواستنەوەیدا سێیان لە خێزانەکانی پێغەمبەرﷺ بەشداری ڕازاندنەوە و بۆن خۆشکردنی (صفیە)یان کرد، (ئەوە ڕێز و مافی ژن و مێردێك بو، کە بە حسابی ئەو کاتە کۆیلە بون)، بەڵام ئایا ئەمڕۆی سەردەمی مافی مرۆڤ و پێشکەوتن، بە چارەکێکی ئەمە ڕێز لە ئازادەکانیش دەگیرێ و بەشداری خەم و خۆشیان دەکرێ، لەم ژن و مێردە (محمدی کوڕی سیرین) کەوتەوە کە لێرەدا جێگەی باس و سەرنجی ئێمەیە!.

کاتێك (محمد) لە دایك بو، تەنها (دوو ساڵ) لە خیلافەتی (عثمان) مابو..کە پێگەیشت سودی تەواوی وەرگرت لە عیلم و زانستی ئەو هاوەڵانەی پێغەمبەرﷺ کە مابون لە ژیاندا، لەوانە: (زید بن ثابت، أنس بن مالك، عبدالله بن عمر، عبدالله بن الزبیر، أبو هریرة و هەندێکی دیکە)، پاشان بە ماڵەوە چونە (بصرە)، کە ئەو کاتە بنکەیەکی سەربازی گەورە بو بەرەو عێراق و وڵاتی فارس و بنکەیەکی بازرگانی و مەڵبەندێکی زانست بو..

(محمدی کوڕی سیرین) کاتەکانی خۆی دابەش کردبو، بەیانیان زوو ڕوی لە مزگەوتی بەصرە دەکرد و خەریکی فێربون و فێرکردن بو، تا خۆر بەرز دەبویەوە و ئەوکاتە ڕوی لە بازاڕ دەکرد، بۆ بازرگانی کە شەویش دادەهات ڕوی لە قورئانەکەی خوا دەکرد و بە دەم خوێندنەوەوە بە دڵ و بە چاو دەگریان، تا ئەو ڕادەیەی کەس و کار و دەرو دراوسێی بەزەییان پێ دادەهاتەوە، بە ڕۆژ بەردەوام یاد و ترسی خوای وەبیر خەڵکی دەهێنایەوە، تا ئەو ڕادەیەی کاتێك خەڵکی سەرقاڵ بە بازرگانی ناو شاری بەسرە دەیان بینی خێرا بیری خوایان دەکەوتەوە و (لا الە الا الله) و (الله اکبر)یان دەکرد...بە هەڵس و کەوتیش چاکترین مامۆستای خەڵکی بو لە مامەڵە کردندا و هەمیشە ڕەزامەندی خوای ڕەچاو دەکرد لە مامەڵەکردندا ئەگەر زیانی ماددیشی لێ بکەوتایە...

وردەکاری ئەو پیاوە لە دیندا تا ئەو ڕادەیە بو، کە هەندێ جار لێی تێ نەدەگەیشتن، بۆ نمونە جارێکیان کابرایەك بە ناهەق داوای دوو درهەمی لێدەکرد و دەیگوت: تۆ دوو درهەم قەرزداری منی، ئەویش دەیگوت شتی وا نییە و نەیدەدایەوە، کابراش گوتی: سوێند دەخۆیت، کە دوو درهەمم لات نییە؟ ئەویش گوتی: بەڵێ و سوێندی خوارد بۆ کابرا، لێرەدا زۆر پێیان سەیر بو کە ئەم بۆ دوو درهەم سوێند دەخوات! بە مەرجێك ئەم ماوەیەك لەمەوبەر لەبەر هۆیەکی بچوك دەستی لە چل هەزار دینار هەڵگرت، ئەویش لە وەڵامدا گوتی: بەڵێ سوێند دەخۆم، چونکە من دڵنیام کە ئەو دوو درهەمە بۆ ئەو حەڕامە و حەز ناکەم حەڕام بخوات.

(محمدی کوڕی سیرین) هەرچەند باسی خراپەی خەڵکی لا کرابایە، ئەم خێرا باسی چاکەیەکی دەکرد، تەنانەت ڕۆژێك باسی خراپەی (حجاج)یان لە لای کرد، ئەویش گوتی: بێ دەنگ ئامۆزا ئێستا حجاج چۆتە بەردەستی خوای خۆی، تۆش کاتێك دەچیە بەردەستی خوای گەورە، ئەو کاتە بچوکترین گوناهی خۆتت لە گەورەترین تاوانی حجاج لا گەورەترە، چونکە ئەو ڕۆژە هەر کەس

سەرقاڵی خۆیەتی، ئەوەش بزانە خوای باڵادەست تۆڵەی هەمو ئەوانە لە حجاج دەستێنێتەوە، کە حجاج ستەمی لێکردوون، هەروەك چۆن تۆڵەش لەوانە دەستێنێ، کە ستەمیان لە حجاج کردوە، لەمەودوا خۆت بە قسە پێ گوتنی خەڵکی خەریك مەکە.

(محمد کوڕی سیرین) وەك هەمو پیاوانی ناوداری ئەم ئوممەتی ئیسلامییە هەڵوێستی ئازاد و بوێرانەی هەبوە لە گوتنی هەقدا، ڕۆژێك والی عێراق لە سەردەمی (بني أمیة)دا دەنێرێت بە دوایدا بۆ سەردانی ئەمیش لەگەڵ ئامۆزایەکەیدا ڕۆیشت بۆ لای، والیش بەوپەڕی ڕێز و حورمەتەوە پێشوازی لێکردن و گەلێك پرسیاری کاروباری دین و دونیای لێکرد، پاشان گوتی: دەنگ و باسی شارەکەتان کاتێك هاتن؟

ئەمیش گوتی: کاتێك هاتین ستەم بەربڵاو بو، تۆش بێ ئاگا بوی لێیان، ئامۆزاکەی شانێکی تێ کوتا بۆ ئەوەی ئەم قسانە نەکات، ئەمیش گوتی: پرسیار لە من دەکرێ و لە تۆ ناکرێ و ئەمەش شاهێدییە و هەر کەسێکیش شاهێدی هەق نەبێت تاوانبارە، ﴿وَمَن يَكْتُمْهَا فَإِنَّهُۥٓ ءَاثِمٌ قَلْبُهُۥ﴾[1].

کاتێك هەستان لە مەجلیسەکەدا والی بە هەمان ڕێزی لێگرتن و بەڕێی کردن و کیسەیەکی (٣٠٠٠) دیناریشی بۆ نارد بە خەڵات، بەڵام وەری نەگرت و گێڕایەوە، ئامۆزاکەی گوتی: بۆ وەری ناگریت؟!

ئەمیش وەڵامی دایەوە: (کەم کەس بتوانێ بەم شێوەیە حاڵی ببێ).

گوتی: ئەو گومانی چاك بە من دەبا و من بە پیاو چاك دەزانێ بۆیە خەڵاتم دەداتێ، دەی ئەگەر وا بێ، کە ئەو لێم تێدەگات دەبێ ئەو خەڵاتە وەرنەگرم (واتە پیاو چاك نابێ پێویستی بە خەڵاتی خەڵکی هەبێت)، خۆ

---

١ـ البقرة/٢٨٣.

ئەگەر وەهاش نەبم، کە ئەو پێم تێگەیشتوە، ئەوکاتەش هەر لێم حەلاڵ نییە و من شایەنی ئەو خەڵاتە نیم.

وردەکاری ئەم پیاوە زۆر بێ سنور بوە، تەنانەت هەندێك جار بەرگەی زیانی گەورەی گرتوە لە مامەڵەدا لەسەر شتی وا کە خەڵکی تر هیچ بایەخێك بەو شتە نادەن، ئەوەتا جارێك بایی (چل هەزار) دینار ڕۆنی زەیتی کڕیبو بە قەرز، کاتێك سەیر دەکات یەکێك لە هیزە ڕۆنەکان مشکێکی دارزاوی تێدایە، ئەمیش لە بیری خۆیدا گوتی: دیارە ئەم مشکە لە کارگەکە تێی کەوتوە و تایبەت نییە بەو هیزەیە، بە تەنیا و گشت ڕۆنەکە پیس بوە، ئەگەر بیگەڕێنمەوە بۆ خاوەنەکەی لەوانەیە بیفرۆشێتەوە بە خەڵکی دی، لەبەرئەمە هەر هەمو ڕۆنەکەی ڕشت و خۆی کرد بە ژێر قەرزەوە.

هەر لەسەر قەرزی ئەو ڕۆنە خرایە بەندیخانە، چونکە خاوەنەکەی داوای کرد و ئەمیش نەیبو بیداتەوە، بەڵام ئەو پیاوە لە بەندیخانەشدا هەر خاوەن هەڵوێست بو، پاسەوانی بەندیخانەکە دیتی چەند پیاوێکی بە تەقوا و خاوەنی عیبادەتێکی زۆرە، دڵی بۆی سوتا و پێی گوت: شەوانە دەتوانی بچیەوە ماڵی خۆت و بە ڕۆژ بێیتەوە بۆ بەندیخانە و بەم شێوەیە، تا ماوەی بەندییەکەت تەواو دەبێ، بەڵام ئەم قبوڵی نەکرد و دەیگوت: حەز ناکەم فێری خیانەت کردنت بکەم لە کارەکەتدا.

هەر لە بەندیخانەدا بو (انس کوڕی مالك) کاتی مردنی هاتبو، وەسیەتی کرد ئەگەر مرد با محمدی کوڕی سیرین بیشوات و نوێژی لەسەر بکات، کاتێك وەفاتی کرد هاتنە لای والی و وەسیەتەکەی هاوەڵەکەی پێغەمبەریان پێڕاگەیاند، ئەویش ڕازی بو، کە ڕێگە بدەن بە محمدی کوڕی سیرین بڕوات وەسیەتەکە جێبەجێ بکات، بەڵام ئەم دەیگوت: ناچمە دەرەوە لە بەندیخانە تاوەکو ڕەزامەندی خاوەن قەرزەکەش وەرنەگرن، چونکە من لەسەر مافی ئەو بەند کراوم، پاش ڕەزامەندی خاوەن قەرزەکەش ئینجا ڕۆیشت و وەسیەتەکەی

جێبەجێکرد و بۆ ئەوەی سەردانی ماڵ و منداڵی خۆی بکات گەڕایەوە بۆ بەندیخانە.

بە ڕاستی تەنها (عاصم الأحول) توانیویەتی پێناسەی ئەم پیاوە بکات، کە دەڵێت:

(ما رأيت رجلاً افقه في ورعه ولا أورع في فقهه من محمد بن سيرين).

واتە: کەسم نەدیتوە وەك محمدی کوڕی سیرین زانا و تێگەیشتو بێت لە وەرع کردنەکەیدا، هەروەها وەرەعیشی هەبێت لە زانایی و تێگەیشتنەکەیدا.

(هشام بن حسان) دەڵێت: محمدی کوڕی سیرین کاتێك بانگکرا با بۆ سەر دەعوەت و نان خواردن، دەچو لە ماڵی هەندێك دۆشاوی خورمای دەخوارد، ئینجا دەڕۆیشت بۆ دەعوەتەکە، کاتێك پێیان گوت: تۆ بۆ سەر دەعوەت دەچی ئەم دۆشاوە چییە دەیخۆی؟!

لە وەڵامدا دەیگوت: (حەز ناکەم برسیەتی سکم بەسەر سفرەی خەڵکییەوە تێر بکەم).

یەکێك لە قسەکانی ئەم پیاوە ئەوەیە کە دەڵێت: (ئەوە ستەمکردنە لە برایەکەت، گەر خراپترینی ئەوەی کە دەیزانی لە بارەیەوە بیڵێیت و چاکەکانی بشارییەوە).

ئەم پیاوە کاتێك پرسیاری لێکدانەوەی خەونیان لێدەکرد، دەیفەرمو لە خوا بترسە لە کاتی بە خەبەریدا، ئەوی لە خەودا دەیبینی زیانت لێ نادات.

(أتق الله في اليقظة لا يضرك ما رأيت في المنام).

(محمدی کوڕی سیرین) سەرەڕای هەمو ئەو خەسڵەتە جوانانە، خاوەنی گەورەترین پلە وپایەیە بەهۆی هاوبەشی کردن لە گەورەترین خزمەت بە ئیسلامدا، ئەویش بە بەشداری کردنی لە گەیاندن و گێڕانەوەی فەرمودە شیرینەکانی پێغەمبەرﷺ وەك (محدث)ێك، ئەم پیاوە فەرمودە شیرینەکانی

پێغەمبەری گێڕاوەتەوە لە (زيد بن ثابت) و ابن عمر و ابن عباس، ابي سعيد و عمران بن حصين و جندب و أنس و أبي هريرة و أبي بكر)ەوە.

بەم پێیە محمد بن سيرين هەر سێ بەهرەی (علم و فقه و ورع)ی پێکەوە گرێ داوە، نمونەیەکی لە هەڵکەوتویی پیاوانی ئەم ئوممەتە تۆمار کردوە و لە سالانی (١١٠)ی کۆچیدا لە تەمەنی هەشتاو ئەوەندا ساڵیدا، پاش (حسن البصري) بە سەد ڕۆژ بەسەر بەرزی و ڕوسوری ماڵئاوایی لە دنیاکرد و ئەرکی گەیاندنی ئەم دینەی بۆ نەوەکانی، پاش خۆی بەجێ هێشت، ئەمەیە بۆ خوا ژیان و ئاوەها دەبێ حاڵی بون لە دین و هەڵوێستی زانایان دەبێت بەم شێوەیە بێت، ئەوجا دەبنە جێگەی ئومێد و بۆ چاوساغی دەشێن لەمانەش بترازێ دەست بڕینە بە ناوی دینەوە.

ڕاستە زیندوو کردنەوەی ڕێبازی ئەو پیاوانە ئاسان نییە و ڕۆیشتن بەو ڕێگەیەدا لە هەمو کەس نایەت! بەڵام خۆ دەبێت هێندەش بوێر و ئازا نەبین لە لێدانی لاف ماموۆستایەتی و زانایەتی و لە دین حاڵی بون، دەبو بەو ئەندازەیەش هەست بە کەمی و خۆ بە کەم زانینمان هەبوایە، نەك بە بێ ئەوەی باجی ڕێگە بدەین و لاف گەیشتن لێ بدەین..

## وانەی شەشەم: ربيعة الرأي

لە ساڵەکانی (٥١)ی کۆچیدا ئەمیری خوراسان، کە یەکێك بو لە هاوەڵانی پێغەمبەرﷺ بە ناوی (الربيع بن زياد) خۆی ئامادە کرد بۆ شەڕی ڕزگار کردنی (بلاد ما وراء النهرين) پەڕینەوە لە ڕوباری (فروخ)، (فروخ) لەم شەڕەدا خوای گەورە سەرکەوتنێکی کەم وێنەی کردە نسیبی لەشکری ئیسلام و فەڕوخیش پاڵەوانێتییەکی باشی نواند تێیدا، (ربيع)ی سەرکردە پاداشتێکی گەورەی دایەوە و ئازادی کرد لە کۆیلەیەتی و بەشێکی باشیش لە دەستکەوتی شەڕی دایە و هەندێکی زێدەیشی لە لایەن خۆیەوە پێ بەخشی.

(فەروخ) بە سەرکەوتوی و ئازادی و سامانێکی باش لە دەستکەوتی شەڕ و بڕێکیش دیارییەوە بە تەمەنێکی (٣٠) ساڵییەوە گەڕایەوە بۆ مەدینە لێرەدا بیری لەوە دەکردەوە، کە ماڵ و ژیانێك بۆ خۆی پێکەوە بنێ، ئەوە بو خانویەکی لە ناوەڕاستی مەدینەدا کڕی و ژنێکی خاوەن ئیمان و ژیریشی هێنا و کەوتە ناز و نیعمەتەوە، بەڵام دڵی هەر لە لای بەرەکانی جیهاد و تێکۆشانی ڕێگەی خوا بو، هەرچەند هەواڵی سەرکەوتنەکانی موجاهیدەکانی بەرەکانی شەڕ دەهاتەوە بۆ مەدینە ئەم زیاتر دڵی ڕادەتەکا و سوێی جیهادی دەهاتەوە بەسەریدا، تا ڕۆژێکی هەینی خوتبە خوێنی مەدینە مژدەی سەرکەوتنی لە بەرەکانی شەڕەوە دا بە موسڵمانان و هانی دان لەسەر جیهاد و تێکۆشان.

بۆیە بڕیاری دا پەیوەندی بکات بە لەشکری موسڵمانانەوە و بەرەو بەرەکانی شەڕ بکەوێتە ڕێ، کە هاتەوە بۆ ماڵەوە هەواڵی ئەم بڕیارەی گەیاند بە خێزانی، خێزانەکەشی گوتی: (پیاوەکە بۆ کێم بەجێ دێڵی بە کۆرپەیەکەوە، کە ئێستا لە دایك نەبوە، تۆ کابرایەکی بێگانەی و هیچ کەس و عەشیرەتت نییە لەم شارەدا)، فەڕوخیش گوتی: بۆ خوا بەجێت دەهێڵم وە (٣٠٠٠٠)هەزار دیناریشم، کە لە دەستکەوتی شەڕ بەرکەوتوە ئەویشت بۆ بەجێ دەهێڵم پارێزگاری لێبکەو بازرگانی پێوە بکە و مەسرەفی منداڵەکەشتی لێبکەتا دێمەوە بۆ لات بەسەرکەوتوی و سەلامەتییەوە یان پلەی شەهیدیم بە نسیب دەبێ کە خۆم ئاواتی بۆ دەخوازم، ئەمانەی گوت و بەرەو مەبەست کەوتە ڕێ...

چەند مانگێکی خایاند کۆرپەکەی لە دایك بو، کۆرپەیەکی هێند جوان و نازدار و پێکەوتو بو، ئەوەندە جێگەی دڵخۆشی دایکی بو خەریك بو بیری باوکی لە بیر بەرێتەوە و ناوی نا (ربیعە).

(ربیعە) هەر لە سەرەتاوە نیشانەی هەڵکەوتویی و نەجابەتی پێوە دیار بو، دایکیشی هەر ئەوەندە بو کوڕەکەی پێگەیشت، خستییە بەردەست مامۆستایان

و پەروەردەگەری بۆ دابینکرد ئەوەندەی نەخایاند فێری خوێندن و نوسین بو، پاشان قورئانی پیرۆزی لەبەرکرد و هەروەها شارەزایی لە فەرمودەدا پەیداکرد و، لە زمانی عەرەبیشدا شارەزا بو، لە بارەی دینیشەوە شارەزایی پەیدا کرد...

دایکیشی درێغی نەکرد لەگەڵ مامۆستاکانی کوڕەکەی بە بەخشینی دیاری و بەخشیش، هەرچەندە کوڕەکەی زیاتر پێگەیشتبایە ئەمیش زیاتر دیاری دەدایە مامۆستاکانی لەگەڵ ئەوەشدا هەر چاوەڕوانی باوکی بو، تاوەکو ئەم دیارییە بە نرخە (ربیع)ی کوڕی بۆ بکاتە مزگێنی و دڵی پێ خۆش بکات...

بەڵام (فەڕوخ) هەر دیار نەبو، پاشان بە چەندین جۆر هەواڵی دەهات، هەندێك هەواڵی ئەسیر بونیان هێنا و هەندێکیش دەیان گوت: لە بەرەکانی شەڕ دایە و بەردەوامە لەسەر جیهاد، بەڵام هەندێکی تر هەواڵی ئەوەیان هێنا، کە (فەڕوخ) بە پلەی شەهادەت گەیشتوە و ئاواتەکەی هاتۆتە دی.

ئەم هەواڵی سێیەمیان زیاتر لە دڵی چەسپی و بۆیە گەلێك خەفەتی لێ خوارد و دڵی غەمبار بو بۆی و کەوتە دوعای خێر بۆ کردنی لای خوای گەورە و داوای پلەی بەرزی قیامەتی بۆ دەکرد...

لەم کاتانەدا (ربیعە) تەواو گەورە بو، بۆیە دۆستانی بە دایکیان گوت، کە ئیتر (ربیعە) گەورە و جێگەی خۆیەتی پیشەیەکی بۆ دەست نیشان بکەی و ئەمیش خێرا فێری دەبێت و بژێوی خۆی و تۆیش پەیدا دەکات، دایکیشی گوتی: لە خوای گەورە داواکارم ئەوەی خێری دونیا و قیامەتی تێدایە بۆی دابین بکات.

بەڵام (ربیعە) زانستی بۆ خۆی هەڵبژارد و عەزمی کرد لەسەر ئەوەی کە ژیانی تەرخان بکات بۆ فێربون و فێرکردن...

بۆیە (ربیعە) بەرەو کۆڕی عیلم و زانستی ئەو کاتەی مەدینە کەوتە ڕێ و وەك تینوو بۆ ئاو ماندوو نەناسانە هەوڵی دەدا و دەیگوت: (مامۆستاکانمان گوتویانە زانست هەندێ لە خۆیت ناداتێ ئەگەر تۆ هەمو خۆتی نەدەیتێ): (إن العلم لا يعطيك بعضه إلاّ إذا أعطيته نفسك كلها).

ربیعە لە کەڵە پیاوانی تابیعی زانستی وەردەگرت، وەك (سعید بن المسیب، مکحول الشامي، و سلمة ابن دینار و ابو حزم)، ربیعە تەواو هەڵکەوت و ناوبانگی دەرکرد و قوتابیەکانی تەواو دەورەیان دا و ئەمیش نیوەی ڕۆژی تەرخان دەکرد لەماڵەوە بۆ کەس و هاوڕێکانی و نیوەی تریش لە مزگەوتی مەدینە بۆ عیلم و دەرس..

شەوێکی هاوینی مانگە شەو ئەوەی چاوەڕێ نەدەکرا ڕویدا، کابرایەکی تەمەن (٦٠) ساڵە بە کۆڵانەکانی مەدینەدا بە سواری ئەسپێکەوە شمشێر لە ملدا دەگەڕا بە شوێن ئەو ماڵەی کەوا بۆ (٣٠) ساڵ بەجێی هێشتوە، نە کەس دەیناسێتەوە و نە ئەمیش بە تەواوی کۆڵانەکانیش دەناسێتەوە، خەڵکی مەدینەش وا ڕانەهاتبون بە دیمەنی ئەو سوارانەی، کە دێن و دەچن بەرەو بەرەکانی شەڕ و ئەم دیمەنە بە لایانەوە سەرنج ڕاکێش نەبو، بەڵام لە دڵی ئەمدا خەمەکانی زیاتر کردو کەوتە خولیای ئەوەی ئاخۆ ژنەکەی چی کردبێ؟ ئاخۆ منداڵەکەی کوڕە یان کچ؟ ماوە یان مردوە؟ ئاخۆ سامانەکەی ماوە یان نا؟ لەم خەیاڵانەدا بو ڕێی کەوتەوە ماڵەکەی خۆی دیتی وا دەرگا کراوەتەوە و لە تاو خۆشی خۆی بیری نەبو لە دەرگا بدات و مۆڵەتی چونە ژورەوە وەربگرێ بۆیە ڕاستە و ڕاست چوە ژورەوە و خاوەن ماڵەکەش، کە گوێی لە دەنگی دەرگاکە بو دیتی لەبەر ڕۆشنایی مانگە شەودا کابرایەك بە شیر و تیرەوە هاتۆتە ماڵەکەی و ئەوەندەی نەماوە بگاتە نزیك خێزانە گەنجەکەی بۆیە ڕاپەڕی و بە پێی پەتی خۆی گەیاندە کابرای بێگانە و گوتی: ئەی دوژمنی خوا لە پەنا تاریکی شەودا دەدەی بەسەر ماڵەکەمدا و هێرش دەکەیە سەر خێزانم، وەك شێر پەلاماری کابرایدا و بواری قسەکردنی پێ نەدا و هەڵپژان بە یەکدا و کردیان بە هەرا و دەنگیان لێ بەرز بوەوە و، خەڵکی دراوسێ لە هەمو لایەکەوە خۆیان گەیاندە ماڵەکە و یارمەتییاندا، تا کابرای گرت و دەستی نایە بینی و ملی گرت و گوتی: سوێند بە خوا بەرت نادەم ئەی - دوژمنی خوا - تا

نـەت گەیەنمـە دەسـتی والـی...کـابراش گـوتی: مـن دوژمـنی خـوا نـیم و هـیچ گوناهێکیشم نەکردوە و دیتم دەرگاکراوە بو و هاتمە ژورەوە.

پاشان گوتی: ئەی خەڵکینـە ئـەوە مـاڵی خۆمـە و مـن نـاوم (فەڕوخـە)، ئایـا کەس نەماوە لە دەرودراوسێ (فەڕوخ) بناسێ، کە (٣٠) ساڵ پێش ئێستا ڕۆیشت بۆ جیهاد...

لـەم کاتـەدا دایکـی خـاوەن مـاڵ بـە خەبـەر هاتـەوە و لـە پەنجەرەکـەوە مێردەکەی دیت و وەخت بو لە خۆشیاندا زمانی لاڵ بێت و بانگی کرد، وازی لێ بێنن، ئەی (ڕەبیع) وازی لێ بێنە، کوڕم وازی لێ بێنە ئـەوە باوکتـە!!..خەڵکینـە ماڵتان ئاوا بێ وازیـان لێ بهێـنن خـوا پاداشـتتان بداتـەوە، نەکـەی فـەڕوخ ئـەوە کوڕەکەی خۆتە، هـەر ئەوەنـدەی گـوت و ـ ئیـدی ـ فـەڕوخ دەسـتی کـردە ملـی کوڕەکەی و باوەشی پێدا کرد، (ربیعە)ش پەلاماری باوکی دا و دەسـت و سـەر و گەردنی ماچ کرد و خەڵکەکەش بڵاوەیان لێکرد، ئیدی کەوتنە هەواڵ پرسین و دەنگ و باسی یەکتر، پاش ئەوەی بـە تـەما نـەبو لەسـەر زەوی جارێکی دی بـە یـەك بگەنـەوە بـەهۆی دابڕانـی (٣٠) سـاڵ لـە یـەکتر، بـەلام لـەم کاتانـەدا، کـە دڵخۆشی و کامـەرانی هەمویانی داگرتبـو، ئـەم هـەر خـەمی ئـەوەی بـو، ئەگـەر پرسیار لەو هەمو پارەیە بکات ئەم چی وەڵام دەداتەوە، کە هیچی نەماوەتـەوە، ئایا بـاوەڕ دەکات، کـە خـەرجی کوڕێـك (٣٠) هـەزار دینـاری ئـەو کاتانـەی تـێ بچـێت، ئایـا بـاوەڕ دەکـات، کـە کوڕەکـەی چـەندە بەخشـندەیە و پـارە بـە دەستییەوە نامێنێ و بۆ هاوڕێ و براکانی سەرف دەکات؟!

لـەم خەیاڵانـەدا بـو کـە فـەڕوخ گـوتی: ئـافرەت چـوار هـەزار دینـارم بـۆت هێناوەتەوە کوا پارەکە بیهێنە ئەمیشی بخەینە سەر، بەڵکو باخێکی پێبکڕین و ئەوەندەی تەمەنمان ماوە لە پەنایدا بیگوزەرێنین، بەلام ئـەم گـوێی لێ خەوانـد و قسەکەی ون کرد، بەلام دیسان لێی دووبارە کردەوە و گوتی: کوا پارەکە؟!

ئـەمیش گـوتی: لـە شـوێنێك دامنـاوە کـە پێویسـتە لـەوێ دابنـرێ، چـەند ڕۆژێکی دی بۆت دەردەهێنمەوە إن شاء الله...

دەنگی بانگ قسەکانی پێ بڕین و هەستا و دەست نوێژی گرت و گوتی ئەدی کوا (ربیعە)؟

گوتی: پێش تۆ ڕۆیشت بۆ مزگەوت.

کاتێك (فەڕوخ) چوە مزگەوت نوێژەکەی تەواو کرد و سەردانی قەبری پێغەمبەریﷺ کرد، پاش ماوەیەك، کە ویستی لە مزگەوت بچێتە دەر دیتی وا خەڵکێکی زۆر لە دەوری مامۆستایەك کۆبونەتەوە گەورە و بچوك بەوپەڕی ڕێز و تەقدیرەوە گوێ ڕادەگرن و وتەکانی دەنوسنەوە، کش و مات بون بۆ وتارەکەی لەبەر زۆری خەڵکەکەی دەوری، فەڕوخ نەیتوانی بزانێ ئەو مامۆستایە کێیە؟ کاتێکیش تەواو بو خەڵکەکە دەورمیان لێدا و لێی کۆبونەوە و بەرێیان کرد بەرەو دەرگای مزگەوت.

لێرەدا (فەڕوخ) ڕوی کردە کابرایەك و پرسی ئەرێ ئەم کابرایە کێیە؟

کابراش گوتی: تۆ خەڵکی مەدینە نی؟ گوتی: بەڵێ خەڵکی مەدینەم، ئەویش گوتی جا هەیە خەڵکی مەدینە بێت و ئەم مامۆستایە نەناسێ؟ گوتی: ئاخر من (٣٠) ساڵە ڕۆیشتوم بۆ جیهاد و تەنها دوێنێ گەڕاومەتەوە بۆ مەدینە، کابراش گوتی: دەی ئەم مامۆستایە یەکێکە لە تابیعییە بەڕێزەکان و ئیمام و مامۆستا و زانای مەدینەیە، سەرەڕای کەمی تەمەنەکەی، ئەوەتا دەبینی لە مەجلیسەکەیدا (أنس بن أنس - ابو حذیفة النعمان - یحیی بن سعید الأنصاري - سفیان الثوري - أوزاعي) و غەیری ئەوانیش دادەنیشن، سەرەڕای ئەوەش بەخشندە و بەڕێزە.

فەڕوخ گوتی: بەڵام نەت گوت: ناوی چییە؟!

کابرا گوتی: ناوی (ربیعة الرأي)یە، فەڕوخ گوتی: ربیعە الرأی؟! گوتی بەڵێ: ربیعە، بەڵام زانایانی مەدینە پێی دەڵێن (ربیعة الرأي)، چونکە جێگەی پرس و مەشورەتی ئەوانە...

فەڕوخ گوتی: ئەدی باوکی ناوی چییە؟ کابرا گوتی: ناوی فەڕوخە و باوکی (٣٠) ساڵە چوە بۆ جیهاد و دایکی بەم شێوەیە پەروەردەی کردوە و پێی گەیاندوە، کەوای گوت فەڕوخ چاوی پڕ بو لە ئاو و بە پەلە گەڕایەوە ماڵێ، دایکی ڕەبیعە گوتی: (ئەوە چیە)؟! گوتی: خێرە ئافرەت.

گوتی: رەبیعەی کوڕمان بینی لە پلە وپایەیەکی زانست و ڕێزدا بو، کە تا ئێستا هیچ کەسم لەو ئاستەدا نەدیتوە، ئەویش ئەم فرسەتەی وەرگرت و گوتی: دەی ئەوە باشترە یان (٣٠) هەزار دینار؟! گوتی: وەڵلاهی ئەوەم لا چاکترە لە هەمو سامانی دونیا، گوتی دەی ئەوی جێت هێشتبو لەمەدا سەرفم کردوە، ئایا ڕازی بەوە؟!

گوتی: بەڵێ ڕازیم و خوای گەورە پاداشتی تۆیش بداتەوە.

## وانەی حەوتەم: حسن البصري

ژیواری حەسەنی بەسری: شاری بەسرە لە سەردەمی پێشەوا حەسەنی بەسریدا مەڵبەندی فەقیه و وێژەوانان بو، هەبونی ئەم جۆرە لێهاتوانەش کاریگەرییەکی زۆر و دەورێکی دیاری هەبو لە ڕێخۆشکردن بۆ ڕۆشنبیر کردن و پێگەیاندنی ئەم پێشەوایە و، هەمو ئەو کەسانەی کە لە زانست و زانیاری ئەویان هەڵێنجاوە. لەو کاتەدا بو، کە قوتابخانەی بەسرە سەری هەڵداو وەك هەنگاوی سەرەتا و ڕێ خۆشکەر بو بە دامەزراندنی (فێرگەی ڕا) (مدرسة الرأي) لە شاری کوفە کە پەیوەست بو بە بنەڕەتەکانی دین و ئەحکام و ڕاوو بۆچونی بەرز و ڕۆشنبیری فراوان و ئادابی جۆراوجۆر، پێشەوا حەسەنی بەسریش لەو سەردەمەدا ژیاوە و، لە یاوەرە بەڕێزەکانی پێغەمبەریش ﷺ (ئەبو موسای ئەشعەری و ئەنەسی کوڕی مالیك) ڕەزای خوایان لێبێت تا ئەوکاتە لە ژیاندا مابون، هەروەها هۆکاری تریش هەبون بۆ بەرەو پێش چونی بەسرە، وەکو دووری لە (دار الخلافة) و کاروباری ڕامیاری و کەشوهەوا و گەشەسەندنی ژیار و شارستانیەتی شارەکە.

## لە دایك بون و گەشەکردنی:

(حەسەنی بەسری) لە شاری مەدینەی پیرۆز لە ساڵی (٢١)ی کۆچیدا (٦٤١ز) لە دایك بو، باوکی یەکێك بو لەو کەسانەی، کە لە شاری (مەیسان) لە لایەن موسڵمانانەوە دیل کرابو، کاتێك کە چوبوە (مەدینە) (خیرە)ی خواست، کە بەندەیەکی ئازادکراوی ـ ئوم سەلەمە ـ ی خێزانی پێغەمبەرﷺ بو لەبەرئەوەی پێش چونی بۆ مەدینە لە شاری بەسرە ژیا بو، لە مەینەدا ناوی خۆی گۆڕی بە (یەساری بەسری) و ببو بە ئازادکراوی: (زەیدی کوڕی ثابتی ئەنساری) جاری وا هەبو خەیری دایکی حەسەنی بەسری لە ماڵ دەردەچو و دوا دەکەوت، جا ئوم سەلەمە (خوای لێی رازی بێت) مەمکی خۆی دەدا بە حەسەن تا دایکی دەهاتەوە، هەندێك لە زانایان دەڵێن: ئەو هەمو ژیری و فرچکە پاکەی حەسەن بەهۆی بەرەکەتی (ئوم سەلەمە)یەوە بوە (خوای لێی رازی بێت).

(حەسەنی بەسری) لە (وادی القری) گەشەی کرد تاوەکو فێری ڕەوانبێژی و زمان پاراوی بێت و بنەماکانی زمانی عەرەبی فێر بێت، بۆیەش ئەوەندە زمان شیرین و قسە خۆش بوە، هاوچەرخی سەردەمی سەروەرانمان (عومەری کوڕی خەتاب و عثمانی کوڕی عەفان و عەلی کوڕی ئەبو تالیب) بوە.

بۆ خۆشی دەڵێ: کاتێ کو عثمان ﷺ کوژرا من تەمەنم چواردە ساڵان بوە..جا لەو ڕۆژەوەی فیتنە مەزنەکە هەڵگیرسا (عوسمان شەهید کرا) حەسەن لەمانەوە بێزار بو، بۆیە بە خۆی و خێزانەوە گواستیەوە بۆ شاری بەسرە و لەگەڵ کەسانێك لە هاوەڵاندا مایەوە و بە تەمێکردن و پەنددادان و ئامۆژگاری خەڵکەوە خەریك بو.

## زانست و زمان پاراوی:

(حەسەنی بەسری) زانایایەکی فەقیهی کۆکەرەوەی متمانـەداری زمـان پـاراو بو. (عەمری کوڕی علاء) کە یەکێکە لە قوتابیەکانی دەڵێ: (کەسم نـەدیوە بـە قەد حەسەنی بەسری و حجاجی کوڕی یوسفی ثەقـەفی زمـان پـاراو بـێ، هێشتا حسن لە حجاج زمان پاراوتریش بو).

ڕەنگە گەیشتنی حسن بە زانایان و یاوەران لە بەسـرە وەك (ئەنەسـی کـوڕی مالـك) و لێـوە فێربونیـان ڕۆڵێکـی گـەورەی هـەبو بێـت لـە گەشەسـەندنی زۆر لایەنی و لکی زانستە فراوانەکەی بەهۆی زێدە هاتوچۆ کردنیشی بـۆ مزگـەوت، ڕەوانبێـژی و زانسـتی زیـاتر دەبـو، شـارەزاییەکی زۆریشـی لـە ڕاڤـە کـاری و فەرمودە و فیقها وەرگرتبـو، ڕۆژ بـە ڕۆژ ناوبـانگ و شـۆرەتی بـە وڵاتانـدا بـڵاو دەبویەوە، ئەوەش ڕەنگە بەهۆی دوعای (عومەری کوڕی خەتتاب) ﷺ کاتێك أم سلمة - خـوای لێـی رازی بـێ - حەسـەنی بـە بچوکی بـرد بـۆ لای و ئـەویش فـەرموبوی: (اللـهم فقهـه في الـدين و حببـه للنـاس) واتـە: خوایـە شـارەزا و تێگەیشتوی بکە لە ئایندا و لای خەڵکی خۆشەویستی بکە.

ئەوە بو خەڵکی لە هەمو لاوە دەهاتن بۆ لای تاوەکو زانسـت و زانیـاری لێـوە فێر ببن، بەرە بەرە ڕێز و هەیبەتی لە دڵـی خەڵکیـدا زیـادی دەکـرد و ژمـارەی قوتابیانیشـی گەیشـتە دەیـان و سـەدان قوتـابی، (غـەزالی) دەڵـێ: (قسـەکانی حەسـەن زیـاتر بـە قسـەی پێغەمبـەران دەچـون، ڕێنمویشـی گـەلێك لـە ئـی هاوەڵانەوە نزیك بوە یەکجار زمان پاراو بو، حیکمەت و ژیری لێوە دەڕژا).

## زوهد و ڕەوشتی:

(حەسەنی بەسری) سەروەری تـابعین و پێشـەوای ئـەهلی زانسـت و ژیـری و ڕەئی بو لە سەردەمی خۆی، یەکجار زمان پاراو و ڕەوانبێژ بـو لـە پـاڵ لـە خـوا ترسی و زوهد و پارێزگارییەکەی ئەو پێشەوایە نەوەد (٩٠) ساڵ ژیا، تەنانـەت تاکە کەسێك قسـەیەکی ناشـیرینی لێ نەبیسـت و کـارێکی ناپەسـند و نـاڕێکی لێ

بەدی نەکرا، لە حیکمەت و ئامۆژگارییەکانیدا و لە تەمەنی گەورەیی و بچوکیدا هەر پەنای بۆ واتاکانی قورئان و فەرمودەی پێغەمبەرﷺ دەبرد.

کابرایەکی زاهد و خواپەرست بو، زۆربەی کات بە غەمباری دەهاتە بەرچاو، کە دادەنیشت وەك دیل دادەنیشت، کە دەدوا و قسەیشی دەکرد، وەکو یەکێك بو کە فەرمانی دۆزەخی بۆ دەرچوبێ، کاتێك قورئانیی دەخوێندەوە ئەوەندە دەگریا تاوەکو ڕیشی تەڕ دەبو، دونیای خستبوە پشت گوێی و زوهد و دڵتەنگی هەمیشەیی گەیشتبوە ڕادەیەك، کە دەیانگوت: زوهد لای هەشت کەس لە تابعییەکان کۆتایی پێ هات، کە یەکێکیان حەسەنی بەسرییە، کەسی دیکەشمان نەدیتوە دڵتەنگی لەو درێژتر بێت، لە هەمو خەڵکی شارەزاتر بو لە حەڵاڵ و حەرامدا، یەکجار دڵفراوان بوە، هەرگیز بە تەنیا نانی نەدەخوارد، هەر قسەیەکی کردبایە لە ڕەفتارەکانیدا ڕەنگی دەدایەوە، جل و بەرگی وەکو هەژاران وا بون گرنگی بە دونیا نەدەدا.

ئیبراهیمی یەشکریی دەڵێت: هەر جارێك دەم دیت وام دەزانی تازە کارەساتێکی بەسەرهاتوە، ئەمانە و چەندین سیفەتی بەرزی دیکەی گەیاندبویانە پلەیەکی باڵا لە ناو خەڵکدا، تاکو بو بە پێشەوا و، لە گوتەکانیشیدا وەك وێژەوانێکی ڕەوشت بەرز و خاوەن زوهدێکی شکۆدار ئاماژەی بۆ دەکرا..

## کۆڕی ئامۆژگاریەکانی:

(حەسەنی بەسری) لە کۆڕ و مەجلیسەکانیدا خەریکی ئامۆژگاری و دەست گرتنی خەڵکی بو بۆ کاری چاکە و پەند وەرگرتن لە کەسانی دیکە، دەیگوت: ڕەحمەتی خوا لەو کەسەی، کە ئامۆژگاری براکەی و کەس و کاری خۆی دەکات و ئاگاداریان دەکاتەوە لە بارەی: (نوێژ و زەکات و دراوسێ و ماڵەکانیان) و

بەڵکە خوا ڕەحمتان پێ دەکات، چونکە خوای گەورە لە مەرجی بەندەیەکی خۆیدا دەفەرمویت: ﴿وَكَانَ يَأْمُرُ أَهْلَهُۥ بِٱلصَّلَوٰةِ وَٱلزَّكَوٰةِ وَكَانَ عِندَ رَبِّهِۦ مَرْضِيًّا﴾[١].

زۆربەی ئامۆژگارییەکانی ڕێنمونی کردن و یادهێنانەوەی بۆ خەڵکی تێدا بو، هەمیشە لە نێوان قسەکانیدا ئایەتەکانی قورئانی پیرۆز و فەرمایشتەکانی پێغەمبەری ﷺ دەهێنایەوە، لە زۆر کاتیشدا بە گوتەی (یا ابن ادم...) دەستی پێ دەکرد، هەروەك دەیگوت: (یا ابن آدم کیف تکون مسلماً ولم یسلم منك جارك، وکیف تکون مؤمناً ولم یأمن منك الناس).

واتە: ئەی ئادەمیزاد چۆن تۆ موسڵمانی لە کاتێکدا، کە دراوسێیەکەت لێت سەلامەت نەبێت (ئەمین نەبێت)، چۆن ئیمانداریك دەبیت و خەڵکی لێت ئەمین نەبن.

لە دوانەکانیدا زۆر جار پەنای دەبردە بەر چیرۆك و بەسەرهاتی دوور لە شتی پروپوچ و قسە هەڵبەستن و شتی ناڕاست، گەورەترین ئامۆژگاریکەر و حیکایەت خوانی سەردەمی خۆی بوە و لە هەمویان قسە ڕەوانتر بوە، قسەکانیشی هەمیشە لە ناخی دڵییەوە هەڵدەقوڵان.

## نامە و پەیامەکانی:

(حەسەنی بەسری) پێشەوا، زۆربەی نامە و پەیامەکانی بۆ خەلیفە و خەڵکی دیکەش بە ڕێنمونی و ئامۆژگاری دەستی پێ دەکرد، هەروەك لە کۆڕ و کۆبونەوەکانی مزگەوتەکانیش هەروای دەکرد..

گەلێك نامە گۆڕینەوە لە نێوان ئەو و عمری کوڕی عبدالعزیزدا هەبو، بەناوبانگترین نامەکانیش ئەوەیە کە لە سیفەتەکانی پێشەوای دادوەر دەدوێ، کە لە ساڵی (١٩٩)ی کۆچی، بۆی ناردووە..

---

١ـ مریم/٥٥.

کاتێك کە عومەر بو بە خەلیفە، لەم نامەیەشدا شێوازی کاریگەر و بە توانا و لێهاتوانەی حەسەنی بەسری دەردەکەوێت، لە پاشانیش لە لایەن خەلیفەوە بە قازی شاری بەسرە هەڵدەبژێرێت لەبەر چاکەکاری و لێهاتویی.

هەروەها لە نێوان حەسەنی بەسری و (حجاج)دا نامە گۆڕینەوە و ڕوداو هەبون، تێکڕای نامەکانیشی لە لایەن مامۆستا و زانای ناودار (ابن الجوزي)یەوە کۆکراونەتەوە.

## قوتابیەکانی:

کۆڕ و مەجلیسەکانی ئیمام فراوان بون و قوتابیشی زۆر بون، لە دیارترین قوتابیەکانی، واصلی کوڕی عطاء، مالیکی کوڕی دینار و، سوفیانی کوڕی عویەینە و زۆرێکی تریش، زۆری قوتابیەکانیشی بەڵگەن لەسەر زۆری زانست و زانیارییەکەی.

## کۆچی دوایی:

حەسەنی بەسری پێشەوا لە دوا دوای ژیانیدا نەخۆش کەوت و لە دوایین ڕۆژانی ژیانیدا کەسانێك هاتنە لای و پێیان گوت: لە زانستی خۆتمان پێ ببەخشە، ئەویش گوتی: من سێ شتتان پێ دەڵێم، ئینجا گوتی: لە هەمو خەڵکی زیاتر لەو شتانە واز بهێنن کە نەهیتان لێ کراوە، لە هەمو کەس زیاتر ئەو چاکانە بکەن کە فەرمانتان پێکراوە بیکەن، بشزانن هەنگاوی ئێوە دوو هەنگاوە، هەنگاوێك بۆ ئێوەیە و هەنگاوێك لەسەر ئێوەیە، جا بزانن لە کوێ دێن و بۆ کوێ دەچن.

لە پاشدا (حەسەنی بەسری) کۆچی دوایی کرد و مردنیشی بوە ڕوداوێکی مەزن لە ساڵی ١١٠ی کۆچیدا و لە مانگی ڕەجەب و ڕۆژێکی هەینی (جمعە)دا، لە زوبەیری شاری بەسرادا بە خاك سپێردرا و تێکڕای خەڵکی لەو ڕۆژەدا دەستیان لە کاروباری هەڵگرت و بە شوێن جەنازەکەیدا ڕۆیشتن.

## وانەی هەشتەم: وەکیعی کوڕی جەڕاح

وەکیعی کوڕی جەڕاحی کوڕی مەلیحی کوڕی عەدییە، بە ئەبو سوفیانی کوڕی روئاسی ناسراوە، بۆیەش پێی دەڵێن روئاسی، چونکە لە بەرەی (روئاس)ی خێڵی (قەیسی عیلان)، ناسراو بوە، لە ساڵی (١٢٩ك) ـ (٧٤٦ز)ی لە شاری (کوفە) لە دایك بوە، لەو کاتەدا باوکی لەسەر (بيت المال)ی شارەکە بوە، دەشڵێن بنەچەی دەگەڕێتەوە بۆ گوندێك لە گوندەکانی (نەیسابور).

وەکیع لە کوفەدا پێ گەیشت و گەشەی کرد، کە ئەو کاتە شاری زانایان و زانکۆی زانستەکان بوە لە ناو کۆڕی مزگەوتەکان پەروەردە بو بو، زانیاریشی لە زانا دیار و ناسراوەکانی وەردەگرت، کە لە سەروی هەموویانەوە پێشەوا (أبو حنيفە) بو، وەکیع زانستێکی زۆری لێوەرگرت، هەروەك گوێی دەگرت لە زانایانی تری وەکو ئیسماعیلی کوڕی ئەبو خالید و هیشامی کوڕی عوروە و سلێمانی ئەعمەش و ئیبنو جورەیج و ئەوزاعی و سوفیانی ثەوری و شوعبە)، تاکو بو بە یەکێك لە گەورە ناودارانی شوێنکەوتوی شوێنکەوتوان (أتباع التابعين) کە لە زانست و زانیاریدا بە توانا و باڵا دەست بوە..

لە ئەنجامدا گەلێك لە زانا و پێشەواکانمان بونە قوتابی (وەکیع) و گوێیان بۆ گرت و لێیان دەگێڕایەوە، وەکو (عبدالله ی کوڕی موبارەك و ئەحمەدی کوڕی حەنبەل و یەحیای کوڕی معين و علی کوڕی مەدینی و عوسمانی کوڕی ئەبو شعبە) و گەلێکی تریش، چەندین جار وەکیع هاتۆتە (بەغدا) و دواوە و فەرمودەی گێڕاوەتەوە، هەر لە تەمەنێکی بچوکەوە نیشانەی زیرەکی پێوە دیار بوە بۆیە زاناکان ئەوەیان لێ بەدی کردوە، کە مرۆڤێکی چاکەکار و خزمەتکاری دینی لێ دروست ببێت، بۆیە گرتویانەتە باوەش و دەستیان گرتوە و، چاودێرییان کردوە، لەم زانایانەش: (ئیمامی ئەعمەش) مامۆستای بوە، وەکیع دەڵێ: چومە لای ئەعمەش و پێم گوت: فەرمودەم بۆ بگێڕەوە (حدثني)!! پێی گوتم: ناوت چییە؟ گوتم: وەکیع، گوتی: ناوێکی شیاوە و ناوبانگێکیشی دەبێ...!!، وەکیع دەڵێ: هەمو مانگێك دەچومە لای ئەعمەش و ئەو بەشە

ماڵەم بۆ دەبرد، كە لە (بيت المال) لای باوكم بۆم وەردەگرت، ئەويش بۆم دەدوا و بۆی دەگێڕامەوە.

وەكيع هێشتا نێوجەوان بو (لاو) بو (سوفيانی ثەوری) بانگی دەكرد: ئەی روئاسی وەرە بزانم چت بيستوە؟! ئەويش دەيگوت: فلانە كەس وای بۆ گێڕامەوە و وای دەفەرمو، (سوفيان) بزەی دەهاتە سەر لێوان و سەيری بە لەبەركردنی (وكيع) دەهات.

جارێكيان (سوفيان) سەيری چاوی (وەكيع)ی كرد، زيرەكی و لێهاتويی تێدا بەدی كرد و گوتی: ئەم (روئاسی)يە دەبينن؟! نامرێ تاوەكو نەبێتە خاوەن پلە وپايەيەكی بەرز و مەزن!!

كاتێك (سوفيان) كۆچی دوايی كرد، (وەكيعی كوڕی جەڕاح) لە شوێنی دانيشت و هەندێك دەڵێن لە مامۆستاكەی بە پشتەوەتر بو، (العقيتي) دەڵێ: لە لای (حەمادی كوڕی زەيد) بوين لە ساڵی (١٧٠ك) وەكيعيش لە لای بو، كاتێك (وەكيع) هەستا، گوتيان: ئەمە ڕاويەی (سوفيانە)، (حەماد) گوتی: بەڵكو بڵێن ئەمە لە سوفيان باشترە.

(يەحيای كوڕی موعين) دەڵێ: لە وەكيع باشترم نەديتوە، گوتيان تەنانەت عبدالله ی كوڕی موبارەكيش؟! گوتی: عبدالله ی كوڕی موبارەك چاك بو، بەڵام لە وەكيع چاكترم نەديتوە!!.. هەر (يەحيای كوڕی موعين) وەكيع دەهێنێتە ريزی (ئەوزاعی) و دەڵێ: (وا لله كەسم نەيديتوە بە قەد وەكيع بۆ خوا فەرمودە بگێڕێتەوە و كەسيشم نەديتوە لە وەكيع زياتری لەبەربێ، هەروەها (وەكيع) لە سەردەمی خۆيدا وەكو (ئەوزاعی)يە لە سەردەمی خۆيدا).

فراوانترين هەڵسەنگاندنيش دەربارەی (وەكيع) قسەی (ئيبنو عەممار)ە كە دەڵێت: لە سەردەمی وەكيعی كوڕی جەڕاح لە شاری كوفەدا كەس نەبوە لە (وەكيع) فەقيهتر و زاناتر بە فەرمودە، وەكيع شارەزاييەكی تەواوی هەبوە لە جيا كردنەوەی چاك و خراپ.

کۆمــەڵێك زانــای زۆر لــە ترســی (قازیایــەتی) ڕایــان دەکــرد و ناســراون، وەکیعــیش یەکێکــە لــەو زانایانــە، چـونکە لــە دەرچـونی قوتابخانــەی (ئــەبو حەنیفە) و (سوفیانی ثەوری) بوە.

دەگێڕنەوە جارێکیان دەچێت بۆ (بەغدا) لەگەڵ (عبدالله ی کوڕی ئیدریس و حەفصی کوڕی غیاث)، ئەمیری ئیمانـداران دەیـەوێ یـەکێکیان بکاتـە (قـازی) (وەکیع و ئیبنو ئیدریس) رازی نابن بەڵام (حفص) رازی دەبێت کە ببێت بە قازی، جا ئەو زانایانەی، کە قازیایەتیان ڕەتدەکردەوە، پەیوەنـدییان دەپچڕاند لەگەڵ ئەوانەی، کە دەبون بە (قـازی)، هەرچـەندە دۆسـتێکی نزیکیشیان بوبـا، بۆیە وەکیعیش خۆی دابڕی لە (حفص)ی هاوڕێی و هـەتاوەکو مـرد پەیوەنـدی لەگەڵیدا نەبو..

لە (محمدی کوڕی علی وراق)ەوە هاتوە، کە دەڵێ: (لە ئیمام ئەحمەدی کوڕی حەنبـەلم پرسـی: کامیانـت لـە لا خۆشەویسـترە؟! وەکیعـی کـوڕی جـەراح یـان عبدالرحمن ی کوڕی مەهدی؟ گوتی: (حەفصی کوڕی غیاث) هاوڕێ و هـاوەڵی وەکیع بو، جا کاتێك (حفص) بـو بـە قـازی وەکیـع پەیوەنـدی لەگەڵدا پچڕاند تـاوەکو مـرد، بـەڵام (عبـدالرحمن ی کـوڕی مەهـدی) هـاوڕێی (موعـاذي کـوڕی موعـاذي عەنبـەری) بـو کاتێـك معـاذ بـوە قـازی، عبـدالرحمن هـەتاوەکو مـرد پەیوەندی لەگەڵیدا هەر بەردەوام بو..

(ئیمـام ئەحمـەدی کـوڕی حەنبـەل) دەربـارەی زانـایی وەکیـع دەفـەرموێت: (هەرگیز پیاوێکم نەدیت وەکو وەکیـع لـە عـیلم و لەبـەرکردن و سـەنەدەکان و بەشـەکان - الأبـواب - لەگـەڵ دڵکـزی و خۆپارێزییـەکی زۆردا...)، هـەروەها دەفەرموێت: قـەت بـە دوو چـاوانم کەسـێکی وەکـو وەکیعم نـەدیتوە فـەرموده وەکو وەکیع باش لەبەربکات، لە باسی (فیقه)دا زۆر چاك بو، خۆپـارێزی (ورع) و تێکۆشین (الاجتهاد)ی هەبو، ڕەخنە و کەم و کوڕی لە کەس نەدەگرت.

(وەكیع) دەربارەی (زوهد) دەیگوت: زوهد هەر لە حەڵاڵ دایە حەڵاڵیش كەمە، وەكو شتێكی مردار سەیری دونیا بكە، هێندەی لێ وەربگرە، كە ڕات بگرێ، جا ئەگەر حەڵاڵ بێت، ئەوا تۆ زوهدت بوە، خۆ ئەگەر حەرامیش بوە ئەوا تۆ هەر هێندەت لێوەرگرتوە كە خۆتی پێ ڕابگری، ئەوەندەش بۆ تۆ حەڵاڵە، ئەگەر شوبوهاتیش بێ، ئەوا سەركۆنە كردنێكی كەمی لەسەرە!!

زۆر جار قوتابی و هاوڕێكانی سكاڵای حاڵی خۆیان لای دەكرد و داوای دەرمانی دەردی دەروونیان لێدەكرد، ئەویش وەكو دوكتۆرێكی لێزان دەردەكەی دیاری دەكرد و ڕێی رزگار بونی نیشان دەدان، هەروەكو جارێكیان (ئیمام شافیعی) (سكاڵای خراپی لەبەركردنی خۆی لا دەكات، ئەویش پێی دەڵێت: (واز لە گوناهكردن بهێنە)، ئینجا (شافیعی) ئەم ڕوداوە لە دوو بەیت شیعردا كۆ دەكاتەوە و دەڵێ:

شــكوت الى وكيــع ســوء حفظــي
فأرشــدني الى تــرك المعاصــي
وأخبرنــي بــان العلــم نــور
ونــور الله لا يهــدى لعاصــي

وەكیع بە درێژایی ڕۆژگار هەر لە نێوان كۆڕی دەرس و خوێندن و میحرابی نوێژكردندا دەهات و دەچو، بە قورئان فێركردن و فەرمودە گێڕانەوە و فتوا دانەوە خەریك بوە، لە جەژنەكان و ڕۆژی گومان (یوم الشك) نەبێت، بەردەوام بەڕۆژوبوە، ئەوكاتەی دەستی بەتاڵ بو بێت بە قورئان خوێندن و یادی خوا بەسەری بردوە، شەوانەش بۆ ماوەیەكی زۆر قورئانی دەخوێند و دوای ئەوەی، كە كەمێك دەنوست، دووبارە هەڵدەستایەوە و بە نوێژ و قورئان خوێندن و پاڕانەوە و ئیستیغفارەوە خەریك بوە، تاوەكو دەبوە بەیانی و دوو ڕكاتە سوننەتەكەی پێش نوێژی بەیانی دەكرد، كە پێغەمبەرﷺ دەفەرموێت: (خير من الدنيا وما فيها) چاكترە لە دونیا و هەمو شتێكی لە دونیادا هەیە.

(وەكیع) تا بڵێی: مرۆڤێكی دەست پاك و بێ زیان و بە ئارام بوە.

(مەلیحی) كوڕی دەڵێت: (كە باوكم لەسەرەمەرگ دابو، هەردوو دەستی بۆ دەرهێنام و گوتی: كوڕەكەم دەستەكانم دەبینی؟! هەرگیز بەم دەستانەم لە هیچ شتێكم نەداوە).

هەر كەسێك كە خراپەیەكی بەرامبەر (وەكیع) بكردبایە (ببوایە) ئەم هەر چاكە و بە ڕێك و پێكی وەڵامی دەدایەوە، لە هەمو حاڵ و كاروبارێكدا خاوەنی ئەدەب و ڕێزێكی زۆر بوە، (سەلی كوڕی جونادە) دەڵێ: (حەوت ساڵ لەگەڵ وەكیعی كوڕی جەڕاح دانیشتم، نەم دیت جارێك تفێك بكات، نەم دیت بەردێك هەڵبگرێت، نەشم دیت، ئەگەر لە جێگەیەكدا دانیشت بجوڵێتەوە، هەر كاتێك دیتبێتم ڕو لە قیبلە دانیشتوە، هەروەك بۆ نوێژكردن دابنیشێ، هیچ كاتێكیش نەم دیت سوێند بە خوا بخوات).

وەكیعی زانا لە ڕۆژی عاشورای ساڵی (١٩٧ك) و (٨١٢ز) كۆچی دوایكرد، لە كاتی گەڕانەوەی لە حەجی ئەو ساڵەیدا هەر لە ڕێگادا لە شاری مەككەی پیرۆز نێژرا..

خوای گەورە ڕەحم بە وەكیعی فەرمودە ناس و فەقیهو مامۆستا و ڕابەر بكات و پاداشتی بە خێری بداتەوە.

## وانەی نۆیەم: ( ئیمامی بوخاری )

پێشەوا بوخاری: یەكێك بوە لە پیاوە كەم وێنەكانی ئیسلام، لە فەرمودەناسیدا كەس نەبوە شان لە شانی بدات، هەر لە تەمەنی منداڵییەوە ڕا و قسەكانی لە لایەن زانا بەرز و بە تەمەنەكان پەسەند كراوە.

پێشەوا بوخاری: ناوی (محمەدی كوڕی ئیسماعیلی كوڕی ئیبراهیمی كوڕی موغیرەی كوڕی بەردیزبەی (جەعەفی)یە و لە ساڵی (١٩٤ك) لە دایك بوە،

بەردیزبە: فارس بوە و لەسەر دینی نەتەوەکەی مردووە، موغیرە: لەسەر دەستی یەمانی جەعفی بوەتە موسڵمان، هەر لەبەرئەمەشە نازناوی جەعفی لێنراوە، ئیسماعیل: کە باوکی ئیمام بوخارییە، پیاوێکی موسڵمانی لە خوا ترس بوە و لێی دەگێڕنەوە لە سەرەمەرگیدا گوتویەتی: نەمزانیوە درهەمێکی حەرام، یان درهەمێکی بە شوبهە لە ماڵەکەمدا هەبێت.

ئیمام بوخاری، کە باوکی مردوە منداڵ بوە، پاشان دایکی بەخێوی کردوە، هەر لە (٩) ساڵییەوە بە دوای زانست و زانیاریدا گەڕاوە، لە (١٠) ساڵیدا وای بە دڵدا هاتوە، کە فەرمودەکانی پێغەمبەرﷺ لەبەربکات، چەندین مامۆستای بەرز و بەڕێزی هەبوەو دەرسی لێوەرگرتون، خۆی دەڵێت: من لە هەزار و هەشتا کەس فەرمودەم وەرگرتوە، نووسیومەتەوە، تەنها ئەو مامۆستایانەش بون، کە ئەهلی فەرمودە بون، لە (١١) ساڵیدا کتێبی ئیبنوالموبارەکی وەکیعی لەبەرکردوە و ڕا و وتەی ئەوانی زانیوە.

لە ساڵی (١٠)ی کۆچیدا لەگەڵ دایکی و ئەحمەدی برای چونەتە شاری مەککە و حەجیان کردوە، دایکی و براکەی گەڕاونەتەوە خۆشی ماوەتەوە بە مەبەستی کۆکردنەوەی زانست و زانیاری.

خۆی دەفەرموێت: دووجار چومەتە میسر و شام و چوار جاریش چومەتە بەسرە و شەش ساڵیش لە حیجاز ماومەتەوە و زۆر جاریش چومەتە بەغدا و کوفە.

ئیمام بوخاری توانایەکی سەرسوڕهێنەری لە لەبەرکردندا هەبوە، لە هەر کۆڕ و مەجلیسێکدا دانیشتبایە هەر فەرمودەیەکیان گوتبایە دەست بەجێ لەبەری دەکردوە و لە بیری نەچوەتەوە.

(حاشیدی کوڕی ئیسماعیل) ڕەحمەتی خوای لێبێت دەڵێ: بوخاری ماوەی (١٦) ڕۆژ بو لەگەڵمدا دەهاتە مەجلیس و کۆڕی شێخەکانی بەسرە و هیچی

نەدەنوسیەوە، ئێمەش گلەییمان لێدەکرد و دەمان گوت: بۆچی نانوسییەوە؟! گوتی: بێزارتانکردم بێنە بزانم ئێوە چیتان نوسیوەتەوە؟، ئێمەش هەمو نووسراوەکانمان هێنا زیاتر لە (١٦) فەرموده بو، ئینجا ئەویش بێ ئەوەی تەماشایان بکات، هەر لەبەرخۆی هەمویانی بۆ خوێندینەوە!

جارێکیان بوخاری دەچێتە بەغدا، فەرمودەناسەکانی بەغداش ویستیان زیرەکییەکەی تاقی بکەنەوە، ئەوە بو دەکەسیان تەرخان کرد و هەریەکەشیان دە فەرمودەیان ئامادە کرد، بەڵام فەرمودەکان (مقلوب) کردبۆوە، واتە جێ گۆڕکێیان بە ئیسنادو مەتنی فەرمودەکان کردبو، بەم جۆرە هەریەکەیان یەکە بە یەکە فەرمودە مەقلوبەکانیان بۆ ئیمام بوخاری خوێندەوە، ئەویش لە دوای هەر فەرمودەیەکدا دەیگوت: نازانم، تا تەواویانکرد، ئینجا ڕوی کردە یەکەمیان و پێی گوت: تۆ بەم جۆرە فەرمودەی یەکەمت گوت، بەڵام وا نییە و بەم جۆرەیە، ئیدی بەم شێوەیە فەرمودەکانی هەر دە کەسەکەی ڕاست کردەوە، لە ئەنجامدا زاناکان هەمویان زیرەکی بوخارییان بۆ دەرکەوت و دانیان پێدا هێنا.

(محمدی کوڕی حەمدەوی) ڕەحمەتی خوای لێبێ دەڵێ: لە بوخاریم بیست، کە دەیگوت: سەد هەزار فەرمودەی صەحیحم لەبەرە و دوو سەد هەزاری غەیرە صەحیحیشم لەبەرە. بۆ زیرەکی ئیمام بوخاری بەسە کە (عبدالله ی کوڕی منیر) ڕەحمەتی خوای لێ بێت، فەرمودەی لە ئیمام بوخاری وەرگرتوە و، نوسیویەتییەوە، لە کاتێکدا عبدالله مامۆستایەکی ئەو بوە و بوخاریش فەرمودەی لێ وەرگرتوە.

### زوهد و خواناسین:

ئیمام بوخاری زوهدی زۆر بوە و چەندین ڕوداو و سەرگوزشتەی لێ دەگێڕنەوە، خۆی دەڵێ: مانگی بایی پێنج سەد درهەمم ئیشدەکرد و هەموم لە ڕێگەی زانست و زانیاری سەرفکردوە.

جارێك چوە بوە لای ئەبو مەعشەری ضەریر - رەحمەتی خوای لێ بێ - و گوتی: گەردنم ئازاد بکە، گوتی: لە چی؟ گوتی: ڕۆژێك فەرمودەیەکت دەگێڕایەوە و لەگەڵ گێڕانەوەکەتدا دەست و سەرت دەجووڵاند، منیش بەمە موعجەب بوم و زەردەخەنەیەکم کرد، ئەبو مەعشەر گوتی: ئەوە گەردنم ئازاد کردی.

ئیمام بوخاری دەڵێ: ڕۆژێك دووجار لەسەریەك لە خوا پاڕامەوە و خوای گەورەش هەردوکی بۆ گیراکردم، بۆیە چیدی حەز ناکەم بپاڕێمەوە نەوەکو لە چاکەکانم کەم بێتەوە، هەروەها دەڵێ: لەوەتەی زانیومە غەیبەت حەرامە، غەیبەتی کەسم نەکردوە.

ئیمامی بوخاری ئەوەندە بە ئەدەب و بەڕێز بوە، تەنانەت زۆر کەم گوتویەتی: فلان کەس (وضاع)ە و فلان کەس (کذاب)ە بەڵکو دەیگوت: (رماه فلان) (کذبه فلان) (سکتوا عنه) (ترکوه) (فیه نظر)، ئەبو بکەری کوڕی منیر - رەحمەتی خوای لێ بێت - دەڵێ: جارێکیان ئیمام بوخاری نوێژیدەکرد و زەنگە سورەیەك (١٧) جار پێوەیدا کە لە نوێژەکەی بوەوە وتی: تەماشا کەن بزان ئەوە چی بو ئەزیەتی دام، کە تەماشای (پشتی)مانکرد، دیتمان لە (١٧) حەڤدە جێگاوە پێەوی داوە، کەچی هەر نوێژەکەی نەبڕیوە.

(محمدی کوڕی مەنسور) دەڵێ: باوکم بۆی گێڕاومەوە و گوتی لە مزگەوت لە مەجلیسی بوخاریدا دانیشتبوین، پیاوێك لەو لاوە شتێکی پیسی لە ڕیشی کردەوە و فڕێی دایە سەر زەوی، دەڵێ: دیتم بوخاری سەرنجی دابو بە خەڵك و شتە پیسەکە، بزانێ کەس هەیە هەڵیبگرێتەوە؟ بەڵام کاتێك زانی کەس ئاگای لێنییە، بۆ خۆی چو شتە پیسەکەی هەڵگرتەوە و خستییە ناو گیرفانی خۆی تاوەکو ڕۆیشتە دەرەوە و لەوێ فڕێی دا...

لە رەمەزاندا: لە شەوی یەکەمەوە برادەرەکانی دەهاتنە لای و ئەویش پێش نوێژی بۆ دەکردن، لە هەر ڕکاتێکدا (٢٠) ئایەتی دەخوێند، بەم جۆرە تا

ڕەمەزان تەواو دەبو، خەتمە قورئانێکی دەکرد، لە نوێژی بەیانیشدا نیوە، تا سێیەکی قورئانی تێدا دەخوێندەوە و لە هەر سێ شەوێکدا خەتمێکی تێدا دەکرد، هەر ڕۆژەش خەتمێکی دەکرد و لە کاتی ڕۆژوشکاندندا تەواوی دەکرد.

ئیمامی بوخاری تیر ئەندازێکی کارامە بو هەردەم نیشانە و هەدەفی پێکاوە، هەروەها زۆر بەڕێز بوە بەرامبەر بە قوتابیەکانی، نانی زۆر کەم خواردووە.

ئیمام بوخاری چەندین کتێبی بێ وێنەی داناوە لەوانە:

(الجامع الصحيح) و (الادب المفرد)، تەرتیب و تەبویبی کتێبی (الجامع الصحيح)ی لە مەککەدا داناوە، ماوەی (١٦) ساڵ پێوەی خەریك بوە و فەرمودەکانی لەناو (٦٠٠) هەزار فەرمودە هەڵبژاردووە، دەڵێ: (هیچ فەرمودەیەکم تێ نەکردوە ئیستخارەم کردوە و دوو ڕکات نوێژم کردوە) هەروەها گوتویەتی: (فەرمودەی صەحیح نەبوبێ لەم کتێبەم نەکردوە) ئەو صەحیحانەی جێم هێشتون لەمانە زۆرترن، ئەمەش بۆ ئەوەی درێژ نەبێتەوە، ئەم کتێبە زۆر ڕاڤە و پەراوێز و کورتکردنەوەی بۆ کراوە، گرنگترینیان ئەمانەن:

١. (عمدة القارئ) للعلامة بدرالدين محمود بن احمد الحلبي.
٢. (ارشاد الساري) للعلامة ابي العباس احمد بن محمد القسطلاني.
٣. (تحفة الساري) للعلامة زكريا الانصاري.
٤. (الكواكب الدراري) لشمس الدين محمد بن يوسف الكرماني.

لە سەروی هەموویانەوە (فتح الباري)یە و دانەرەکەشی (الحافظ أبي الفضل احمد بن علي بن حجر العسقلاني)یە کە لە سەرەتای ساڵی (٨١٧)دا دەستی پێ کردوە و بۆ ماوەی چارەگە سەدەیەك خەریکی بوە، قوتابیە زیرەك و بلیمەتەکانیشی یارمەتیدەری بون تاوەکو لە ساڵی (٨٤٢)دا لێ بویەوە و ئیدی تا مردوە هەر پێیدا چوەتەوە و زیادەی خستوەتە سەر.

کتێبی (الجامع الصحیح) لە دوای قورئان دا بە ڕاستترین کتێب دادەنرێت، ئیمام نەوەوی: (٦٣١ ـ ٦٧٦) دەڵێت: زانایان هەموویان لەسەر ئەوە کۆکن، کە لە دوای قورئاندا، ڕاستترین کتێب، هەردوو کتێبەکەی (صەحیحی بوخاری و موسلیمن) زانایان گشتیان دانیان بەپایەی بوخاریدا هێناوە، فەرمون ئێوە و هەندێك لە وتەی زانایان: ئیمام ئەحمەدی کوڕی حەنبەل دەڵێ:

(خوراسان پیاوی وەکو محمدی کوڕی ئیسماعیلی لێ دروست نەبوە، یحیی ی کوڕی جەعفەری بیکدنی دەڵێ، گەر بمتوانیبایە هەندێ تەمەنی خۆم بدەم بە محمدی کوڕی ئیسماعیل وام دەکرد، چونکە مردنی من مردنی پیاوێکە، بەلاّم مردنی ئەو نەمانی عیلمە.

جارێکیان ئیمام موسلیم بە ئیمام (بوخاری) گوت: مەگەر حەسود دمنا کەس نییە ڕقی لێت بێتەوە، شایەدی دەدەم دونیا کەسی وەکو تۆی تێدا نییە.

جارێکی تریش موسلیم چوە نێو چەوانی ماچ کردوە و پێی گوتوە لێم گەڕێ با پێیەکانت ماچ بکەم، مامۆستای مامۆستایان گەورەی فەرمودە ناسەکان.

(وراق البخاري) ئیمام بوخاری لە خەودا دیتوە، کە لە دوای پێغەمبەرەوەﷺ ڕۆیشتوە و، پێغەمبەرﷺ پێی لە هەر شوێنێکدا دانابێ بوخاریش پێی لە هەمان شوێن داناوە و بەجێ پێی پێغەمبەرﷺ دا ڕۆیشتوە.

ئەبو زەیدی مروزی دەڵێ: لە خەومدا پێغەمبەرمﷺ دیت و پێی گوتم: ئەبو زەید تاکەی کتێبی شافیعی دەخوێنیتەوە و کتێبی من ناخوێنیتەوە، منیش گوتم: ئەی پێغەمبەری خواﷺ کتێبی تۆ کامەیە؟

ئەویش فەرموی: جامعەکەی محمدی کوڕی ئیسماعیل.

ئیمام بوخاری زۆر ئەشکەنجەی لەسەر فیتنەی (خەلقی) قورئان دیتوە، بەلاّم ئەو لەسەر عەقیدەی خۆی دانەبەزیوە و هەر بەم جۆرە وەلاّمی داوەتەوە (الایمان قول و عمل یزید و ینقص والقرآن کلام الله غیر مخلوق وافضل اصحاب

رسول اللهﷺ ابوبكر ثم عمر ثم عثمان ثم علي على هذا حييت وعليه أموت، وعليه أبعث إن شاء الله).

ئەوە بو دەربەدەر كرا و زۆر ڕكەبەرییان كرد، تا لە ئەنجامدا چوە گوندێكی سەمەرقەند و لەوێدا مایەوە، ئەوەندەیان ئەزیەت دابو بۆیە شەوێكیان لە خوا پاڕایەوە و گوتی: (اللهم ضاقت علي الارض بما رحبت فاقبضني اليك)، پاشان توشی نەخۆشییەك بو مانگێكی نەبرد فەرمانی خوای بەجێهێنا و وەفاتی كرد.

دوای ئەوەی كفنیان كرد و نوێژیان لەسەر كرد و خستیانە ناو گۆڕ و گڵیان بەسەردا كرد، كە شاردیانەوە بۆنێكی ئەوەندە خۆش لە گۆڕەكەی دەهات، دەتگوت بۆنی میسكە، ئەوە بو چەند ڕۆژێك بەردەوام بو، عبدالواحیدی كوڕی ئادەمی تەواویسی دەڵێ: پێغەمبەرمﷺ لە خەودا دیت لەگەڵ كۆمەڵێك لە هاوەڵانی لە شوێنێك وەستا بون سەلامم لێكرد و وەڵامی دایەوە و گوتم: ئەی پێغەمبەری خواﷺ بۆچی لێرە وەستاوی؟ فەرموی: چاوەڕوانی محمدی كوڕی ئیسماعیل دەكەم، پاشان دوای چەند ڕۆژێك خەبەری مردنی بوخاریم پێ گەیشت و بۆم دەركەوت، هەمان ڕۆژ مردوە كە خەونەكەم دیتوە، ئەوە بو ئیمام بوخاری لە شەوی (شەممە) كە شەوی جەژنی رەمەزان بو لە ساڵی (٢٥٦)ی كۆچیدا ئەمری خوای بەجێ هێنا.

### وانەی دەیەم: ( دیمەنێكی بەهەشت )

(رافع كوڕی عبدالله) دەڵێت: (هشام كوڕی یحیی الكتانی بۆی گێڕامەوە و گوتی: ئێستا بەسەرهاتێكت بۆ دەگێڕمەوە كە بە چاوی خۆم دیتومە و خوای گەورە كردیە مایەی سود و كەڵكێكی زۆر بۆ من، بەڵكو سودی بۆ تۆش هەبێت، منیش گوتم (ابو ولید) بۆم بگێڕەوە، گوتی:

لە ساڵی ٨٨ی كۆچیدا چوین بۆ جیهادی ڕۆمەكان، پیاوێكمان لەگەڵ بو ناوی (سعیدی كوڕی حارث) بو عیبادەت و پەرستشی زۆر دەكرد، بە ڕۆژ بەڕۆژوو بە

شەو شەونوێژی دەکرد، ئەگەر ڕێمان بکردایە قورئانی دەخوێند بەڕێوە، ئەگەر دانیشتباین یادی خوای دەکرد و تەسبیحاتی دەکرد، شەوێکیان من و ئەو پاسەوان بوین، زۆر دەترساین، گەمارۆی قەلایەکی ڕۆمەکانمان دابو، بەلام زۆر ماندوو بوین بە دەستییەوە، لەو شەوەدا زۆر سەرم سوڕما لە عیبادەتی سعید، لەو هەمو توانا و وزەیەی، کە هەیبو، منیش ووتم: خوا لێت خۆش بێت ئەوەندە خۆت ماندومەکە، ئاخر نەفسیش مافی خۆی هەیە بەسەرتەوە، کەمێك پشوئیسراحەت بدە بە نەفست، بەلام سعید دەستیکردە گریان و گوتی براگیان، ژیانی دونیا چەند هەناسەیەکە و چەند ڕۆژێکە، هەر دەبێت ڕۆژێك بێت کۆتایی بە تەمەنمان بێت، من پیاوێکم چاوەڕوانی مردن دەکەم، چاوەڕوانی دەرچونی گیانم دەکەم، رافع دەڵێت: منیش دەستم کردە گریان و پێم گوت: توخوا بڕۆ ناو خێمەکە و کەمێك پشوبدە و بنو، ئەویش چوە ناو خێمەکەوە و نوست، منیش لەم لای خێمەکەوە دانیشتم، هێندەی نەبردگوێم لە هەندێك قسە بو لە ناو خێمەکەدا، لە دڵی خۆمدا گوتم، جگە لە سعید کەسی دیکەی تێدا نییە، دەبێ لەگەڵ کێدا قسە بکات؟ کەمێك نزیك بومەوە، تەماشام کرد نوستو شەو پێدەکەنی و قسە دەکات، هەر ئەوەندەم لە قسەکەی لە بیر ماوە، کە دەیگوت: (بە ڕاستی حەز ناکەم بگەڕێمەوە، دەستی ڕاستی درێژ دەکرد، وەکو دەستبدات لە شتێکەوە و بە هێواشی دەستی دەگێڕایەوە، بەردەوامیش پێدەکەنی، بە دەم خەندەوە، ئینجا لە خەو ڕاپەڕی و کەمێك شپرزە بو، منیش گرتمە باوەش و ماوەیەکی باش هەر تەماشای ئەملا و ئەولای خۆی دەکرد، تاوەکو هۆشی هاتەوە سەرخۆی، ئینجا چەند جارێك گوتی: (لا اله الا الله...الله اکبر) هەر دووبارەی دەکردەوە منیش گوتم: خێر بو چت دیت؟ گوتی: بەڵێ...، گوتم: چت دیت بۆم بگێڕەوە، من گوێم لێت بو، دەتگوت: (بە ڕاستی حەز ناکەم بگەڕێمەوە). چاویشم لە دەستت بو کە بە هێواشی درێژت دەکرد و دوایی گێڕاتەوە: گوتی بۆت ناگێڕمەوە، گوتم: تو

گەورەیی خوا بۆم بگێڕەوە، گوتی: لای کەس باسی نەکەی؟ گوتم: دڵنیا بە گوتی: (لە خەودا قیامەت هەستا بو، خەڵکی هەموی لە گۆڕەکانیان هاتبونە دەرەوە و چاویان ئەبڵەق بوبو، چاوەڕێی فەرمانی پەروەردگاریان بون، منیش وەکو یەکێك لەوان بوم، هەر ئەوەندەم زانی دوو پیاوی زۆر جوان هاتن بۆ لام و سڵاویان لێکردم، منیش وەڵامم دانەوە، گوتیان (ئەی سەعید مژدە بێ لێت خوای گەورە لە هەمو گوناهێکت خۆشبوە، کردەوە چاکەکانی قبوڵ کردیت، سوپاسنامەی بۆت هەیە، دوعاکانیشی لێ وەرگرتی، ئاواتت هاتە دی، دەی فەرمو، تەشریفت بێنە لەگەڵمان با ئەو شوێنە پڕ ناز و نیعمەتەی بۆی ئامادەکردووی، نیشانت بدەین).

سعید دەڵێت:

(منیش چوم لەگەڵیاندا تاوەکو دەریانکردم لە ناو قەرەباڵغییە زۆرەکەدا و، تەماشام کرد ئەسپێکی جوانیان بۆ هێنام لە وێنەی ئەسپی دونیا نەدەچو، بەڵکو دەتگوت هەر بروسکەیە، یان ڕەشەبایە دەردەچێت، ئێمەش سواری ئەسپەکە بوین و ڕۆیشتین، تا گەیشتینە کۆشکێك هێندە بەرز بو، هێندە گەورە و فراوان بو، چاوی ئینسان پەی بە ئەمپەڕ و ئەوپەڕی نەدەبرد، ئینجا لە جوانی و قەشەنگیدا دەتگوت زیوە، ڕوناکی و تیشکێکی لێدەبوەوە، وەکو مرواری ڕەنگین، کاتێك گەیشتینە دەرگاکەی، بێئەوەی داوا بکەین دەرگاکەمان بۆ کرایەوە، کە چوینە ژورەوە چی دەبینین؟! بەڕاستی هێندە شتی جوان و ڕازاوەمان دیت، کە وەسف ناکرێ بە زمان، بگرە بە خەیاڵیش پەی پێ نابات، ئەوەندەی حۆری و ئافرەتی جوانی لێبو، ئەوەندە منداڵی خنجیلانەی لێبو! هێندەی ژمارەی ئەستێرەکان دەبو...

بەڵێ کاتێك، کە ئێمەیان دیت بەخێر هاتنێکی زۆر گەرم و پێشوازییەکی زۆر جوانیان لێکردین، بە وتەی شیرین و جوان، بە ئاوازی جۆراوجۆر دەهاتن بە دەممانەوە، لەم کاتەدا گوێم لێبو یەکێکیان گوتی: ئەم پیاوە دۆستی خوایە، ئەم پیاوە وەلی خوایە، یاخوا بەخێر بێ بەسەرچاوان، ئێمەش لەسەر ڕۆیشتنی

خۆمان بەردەوام بوین، تا گەیشتینە چەند مەجلیسێك بە کورسی و قەنەفەی زێڕ و ئالّتون ڕازابۆوە، بە مرواری و گەوهەریش ئەوەندەیکە جوانکرابوو، کورسی مەگەر پەرومردگار بزانێت ڕادەی جوانیان چەندێکە...

لە ناوەڕاستیشیاندا ئافرەتێکی بالاّ بەرز دانیشتبو، لە هەمو ڕویەکەوە لەوان جوانتر بو،...دوو پیاوەکە پێیان گوتم: ئەم خانووە ملّکی تۆیە، ئەمانەیش کەس و کاری تۆن و لە خزمەتی تۆدان، هێندەی دیکە شت لە شوێنێکی دی بۆ ئامادەکراوە،...ئینجا ئەوان ڕۆیشتن و ئافرەتەکان هاتنە بەخێرهاتن و پێشوازی کردنی من، هەریەك بە جۆرێك بە لەنجەو لار بە دەورەمدا دەهاتن و دەچون، هەروەکو چۆن کەسێك بڕوا بۆ گەشتێك و ماوەیەکی زۆری پێ بچێت، کاتێك کە دێتەوە هەمو کەس و کاری هەمو خزمانی لێی کۆدەبنەوە، ئینجا ئەم لاو لایان گرتم و ئینجا هەلّیان گرتم تا بردمیانە سەر قەنەفەکەی ناوەڕاست و لە تەنیشتی ئافرەتە بالاّبەرزەکە دایان نام، گوتیان: ئەمە خێزان و هاوسەرتە، هاوسەرێکی کەشت هەیە، ئێمە زۆر دەمێکە چاوەڕوانی تۆین، منیش دەستم کرد بە قسە کردن لەگەلّ هاوسەرەکەمدا، گوتم: ئێستە من لە کوێم؟ ئەم شوێنە کوێیە؟ گوتی: ئەمە (جنة المأوى)یە واتە: بەهەشتی مانەوەیە، گوتم ئەدی تۆ کێی؟ گوتی: هاوسەری تۆم بە یەکجاری و نەمری، گوتم: ئەدی هاوسەرەکەی دیم لە کوێیە؟ گوتی: لە کۆشکەکەی دیتدایە...

گوتم: زۆر باشە، ئەمڕۆ لەگەلّ تۆدا دەمێنمەوە وە سبەینێش دەچم بۆ لای ئەو، ئینجا بە هێواشی دەستم برد بۆ لای دەستی، ئەویش بە هێواشی دەستی گێڕایەوە و گوتی: ئەمڕۆ دەگەڕێیتەوە بۆ دونیا و لەوێ سێ ڕۆژ دەمێنییەوە. گوتم: (حەز ناکەم بگەڕێمەوە)، گوتی: پێویستە و هەردەبێ بگەڕێیەوە، ئەوەبو هەستامەوە، کە خوا حافیزی لێبکەم یەکسەر بێدار بومەوە لە خەوەکەم.

هشام دەڵێ: منیش دەستم کردەگریان و گوتم: سعید گیان پیرۆزباییت لێدەکەم، لەمەودوا زۆرتر شوکری خوا بکە، چونکە پاداشتەکەی خۆتت دیت و خوای گەورە بەهەشتی نیشان دای،...

گوتی: کەسی دیت لەگەڵدا نەبو ئەوکاتەی کە خەونەکەم دەبینی؟

گوتم: نەخێر. گوتی: تو گەورەیی خوا تا ماوم لە ژیاندا باسم مەکە، با نهێنی بێت لە نێوانماندا، ئینجا هەستا خۆی شۆرد و بۆنی خۆشی لەخۆی دا و، سیلاحەکەی هەلگرت و بەرەو مەیدانی جەنگ بەڕێ کەوت، بە زمانی بەرۆژووەوە بەم شێوەیە شەڕیدەکرد، ناوبانگی دەرکردبو بە تایبەتی ئەو ڕۆژە خەڵکی دەیانگوت، هەرگیز وەکو ئەمڕۆ خۆت ماندوو نەکردوە، چونکە بە ڕاستی هیچ سڵی لە دوژمن نەدەکردەوە و، خۆی دەخستە نارەحەتییەوە، هێندە نزیك دەبووەوە لە دوژمن، کە تیر بارانیان دەکرد بەرد بارانیان دەکرد، منیش لە دڵی خۆمدا دەمگوت، ئەگەر دەیانزانی بەهەشت چۆنە، وەکو تۆ ئەوانیش خەوێکیان بە بەهەشتەوە دەبینی، رەنگە لە تۆ زیاتر هەڵمەتیان بردبایە و پێشبڕکێیان لەسەر شەهیدی کردبایە..

بەڵێ ئینجا دەستی کرد بە شەونوێژ کردن و دوایی پارشێوی دەکرد و بۆ بەیانی بەرۆژوو بو، بەلام لە دوێنێ زیاتر لە شەڕ خۆی ماندوو دەکرد، هەروەها بەو شێوەیە سێ شەوو سێ ڕۆژ، لە ڕۆژی سێیەمدا من چاودێریم دەکرد بزانم چی دەکات، کەچی دەبینم کام شوێنە پڕە لە مەترسی و نارەحەتی و کەس خۆی لە قەرە نادات، ئەو تەکان دەدات بۆی و هەڵمەت بۆ ئەوێ دەبات، هیچیشی بەرناکەوێت...

بەم شێوەیە هەر خەریکی شەڕ و کوشتار بو بەرامبەر بە دوژمن، تاوەکو دەمە و ئێوارە، ئەوە بو پێش خۆرئاوا بون، تیرێك هات و دای لە گەردنی و خستی، منیش چاوم لێیەتی، کە خەڵکی پێیان زانی دەنگە دەنگ و هاوار هاوارێکی زۆر دروستبو..

خێرا خەڵکی گەیشتنە سەری و هەڵیان گرت و هێنایان، کاتێك پێی گەیشتم گوتم: برۆ لەو شوێنە خۆشە ئەو بەربانگە نۆشی گیانت بکەن، ئێستا چاوەڕێت دەکەن، خۆزگە لەگەڵت دەبوم...

ئەویش لێوی خۆی گەست و بزەیەك گرتی و گوتی: (الحمد لله الذي صدقنا وعده).

(سوپاس بۆ ئەو خوایەی بەڵێنەکەی هێنایە دی بۆمان)، ئەم قسەیەی کرد و گیانی دەرچو...

هشام دەڵێت: منیش هاوارم کرد: (یا عباد الله لمثل هذا فليعمل العاملون).

خەڵکینە ئێوەش هەوڵی ئەو شەهیدییە بۆ خۆتان بدەن، وەرن گوێ بگرن، با دەنگ و باس و هەواڵی ئەم پیاوەتان بۆ بگێڕمەوە، خەڵك لێم کۆبونەوە و منیش ڕاست و ڕێك، وەکو خۆی ئەم هەواڵەم بۆ گێڕانەوە، لە نوکەوە، بەڵێ..، بە جۆرێك دەستیان کردە گریان کە هەرگیز شتی وام نەدیبو..

ئینجا تەکبیرێکیان کرد بە دەنگێکی بەرز، کە سەربازەکان شڵەژان، ئەو ناوە دەنگی دایەوە (الله اكبر...الله اكبر...).

هەواڵەکە بڵاو بویەوە تا گەیشتە فەرماندەکەمان (امیر) کە ناوی (مسلمة) بو، ئەویش هات و ئێمە تەرمەکەیمان دانا بو نوێژی لەسەر بکەین، منیش گوتم: ئەی ئەمیر فەرموو تۆ نوێژی لەسەر بکە و ئێمەش لە پشتی تۆوە،....

گوتی: ئەو کەسە نوێژی لەسەر بکات، کە ئاگای لە هەواڵەکە هەیە، بەڵێ خەڵکی هەر باسی ئەم پیاوەیان دەکرد، ئەوە بو بەیانی بیرمان لە قسەکانی دەکردەوە، ئینجا هاوارێکی گەورەیان کردوو، هەڵمەتیان بردە سەر دوژمن، خوای گەورە یارمەتی داین و ئەو قەڵایەشمان گرت و لە چنگی دوژمن دەرمانهێنا و رزگارمان کرد...خوا لێی خۆش بێت.

## وانەی یازدەهەم: ( مالیك و كۆیلەیەكی خواناس )

مـالیكی كـوڕی دینـار دەگێڕتـەوە و دەفـەرموێت: سـاڵێكیان بـێ بـارانی ڕوی تێكردین لە (بصرە) ئێمەش چەند جارێك لە شار دەرچوین بۆ نوێـژە بارانـە، بەڵام باران نەباری، تا جارێك من و (عطاء السلیمي و ثابت البناني و محمد بـن الواسـع و حبیـب الفارسـي و صـالح المـري) چـەند كەسـێكی دی دەرچـوین، تـا گەیشتینە (مصلی) شوێنی نوێژكردنی (بصـرە) و لـەوێ نوێـژە بارانـەمان كـرد، بەڵام هەر نەباری، خەڵكەكە گەڕانەوە، بەڵام من و (ثابت البنـاني) لـە (بصـرە) ماینەوە كاتێك شەو داهات و دەڕوانین كابرایەكی ڕەشی قـاچ بـاریكی سك(زگ) گەورە، شاڵ و پەشتەماڵێكی خوری پێوەیە هاتە لای ئاوەكە و دەسـت نوێـژێكی گرت و دوو ڕكات نوێژی كورتیكرد و دەستی بەرزكردەوە بۆ ئاسمان و گوتی:

(گەورەم هەتا كـەی بەنـدەكانت بـە دەسـتی خـاڵی دەگێڕییـەوە، ئایـا ئـەوەی هەتـە تـەواو بـوە؟! سـوێندت دەدەم بـە خۆشەویسـتی تـۆ بـۆ مـن، هـەر ئێسـتا بارانمان بۆ ببارێنە...).

مالك دەڵێ: هێشـتا قسـەكانی تـەواو نـەكردبو هـەور ئاسمـانی گـرت و بـاران باری بەسەرماندا هەروەك چۆن گۆزە سەرەو خـوار دەكەیتـەوە، نـەمانتوانی لـە مزگەوت دەرچین، ناچاربوین خۆمـان بـدەین لـە ئاوەكـە، سـەرمان سوڕما لـەم كابرایە ڕەشە. بۆیە لێی چومە پێشەوە و پێم گوت: (ئـەوە شـەرم ناكـەیت لـەو قسەیەی كردت؟).

گوتی: (گوتم چی؟).

گوتم: (كە گوتت: سوێندت دەدەم بە خۆشەویستی تۆ بۆ من، تۆ چۆن زانیت ئەوتۆی خۆش دەوێت؟).

گوتی: دووركـەوە لـێم ئـەی ئـەو كەسـەی نەفسی خـۆت خـەریكی كـردوی و خوای لە بیر بردویەوە، من چی بوم و لە كوێ بوم، كاتێك، ئەو یەكخواپەرسـتی و ناسینی خۆی فێركردوم، ئەگەر خۆشەویستی ئەو نەبایە بۆ مـن، ئایـا ئـەوەی پێ دەبەخشیم؟

ئەمەی گوت و ڕۆیشت، منیش گوتم (پێم گوت): (ئاگایەكت لێمان بێت)!.

گوتی: مـن (كۆیلـە) و ئـەركی گوێڕایـەڵی خاوەنـە بچكۆڵەكەم لەسـەرە (بـە سەرەوەیە)، ڕۆیشت و كاتێك چاودێریم كرد زانیم خۆیكرد بە ماڵی (مسگەر ـ نحاس)ێكدا، سبەینێ، كە ڕۆژ بووەوە، چومە لای مسگەرەكە و پێم گوت:

(غولامێكت هەیە پێم دەفرۆشی). گوتی: بەڵێ سەد غولامم هەیە و یەك بە یـەك هـەمویانی نیشـان دام، منـیش هـەر دەمگـوت: (ئـەوەیان نییـە و یـەكێكی دییە)، تا لە كۆتاییدا گوتی: تەنها یەك غولامم ماوە تەماشام كرد ڕەشـەكەیە و لە ژوورێكی داڕوخـاودا وەسـتاوە، گـوتم (ئەمـەم پـێ بفرۆشـە). كـابرای مسـگەر گـوتی: (ئەمـە غـولامێكی نەگبەتـە و شـومە و هـەر بـۆ گریـان ئازایـە). گـوتم (منیش لەبەرئەمە ئەوەم دەوێت).

كابرای مسگەر بۆی بانگكردم و گوتی: بەهـەر چـەند دەتـەوێت بیبـە، بـەڵام هەر عەیبێكی هەبو لەسەر خۆت.

مالیك دەفەرموێت: (لێم كڕی بە بیست دینار) و، لەگـەڵ خۆمـدا هێنـام، لـە ڕێگە پرسیاری لێكردم و گوتی: (گەورەم بۆچی منت كڕی؟!).

گوتم: بۆ ئەوەی ئێمە خزمەتی تۆ بكەین، گوتی: بۆچی؟!

گوتم: مەگەر تۆ كابرایەكەی دوێنێ نەبوی لە (مصلی)؟!

گوتی: (بۆچی تۆ ئاگات لێبو؟!).

ئەمەی گوت: و ڕۆیشت، تا خۆی كرد بە مزگەوتێكدا و دوڕكات نوێـژی كـرد (خوێنـد)، پاشـان گـوتی: (گـەورەم..ئـەی پـەروەردگارم، ئـەوە نهێنییـەك بـو لـە نێوان مـن و تـۆدا، كەچـی خـەڵكت لێ ئاگاداركردەوە و پێیـان زانیـوە، سـوێندت ئەدەم، كە هەر ئێستا گیانم بكێشی).

مالیك دەفەرموێت: (ئەمەی گوت و گیانی دەرچو).

# بەشی (١٣)

# بەشی پەندی پێشینان

پەندی پێشینان بە شێوەیەکی گشتی لە ڕاستییەکی ئاشکرا و بەرچاوەوە دەدوێ، کە بە شێوەیەکی کورت و ئاسان و ڕێکوپێک داڕێژراوە تاکو زۆرترین کەس لە جەماوەری خەڵك تێی بکەن و مانایەکی فراوان و قووڵی تێدایە و بەری تاقی کردنەوەی دونیا و دیدەی گەلێکە لە هەمو مەیدانەکانی ژیاندا.

* فهل يستقيم الظل والعود اعوج؟
* دار کە لار بو سێبەریش لارە.
* بەردێك نادان بیخاتە گۆمەوە بەسەد دانا دەرنایە.
* ڕێویەکی گەڕۆك لە شێرێکی نووستو چاکترە.
* بە قەد بەڕەی خۆت پێ ڕابکێشە.
* مشتێك نمونەی خەروارێکە.
* زمان بیەڵێ سەر سەلامەتە.
* لافاو لە تکەتك پەیدا دەبێ.
* هەتا گندۆر گندۆر بو خزمی مە گەلێك زۆر بو.
* قسە کەوتە زارێ کەوتە شارێ.
* چی بچێنێت ئەوە دەدروێتەوە.
* مارانگاز لە خشتەی گوریس دەترسێ.
* ئەوەی هێلکەیەك بدزێ گایەکیش دەدزێ.
* رازت لای یەکێك دانێ و پرست لای هەزار.
* تەمبەڵی مایەی هەمو خراپەیەکە.

★ رێوی دەمی نەدەگیشتە ترێ دەی گوت ترشە.

★ پێکەنینی زۆر گریانی لە دوایە.

★ بەر پێت ببینە ئینجا هەنگاو بهاوە.

★ ئەوی لەبەرچاوانە لەبەر دڵانە.

★ سەبر تاڵە و بەری شیرینە.

★ ئەوەی زوو دێت زووش دەڕوا (ئەوی ـ با ـ بیهێنی ـ با ـ ش دەیبا).

★ گوڵ بێ دڕك نابێت.

★ ئاسنی سارد مەکوتە.

★ بە تیرێك دوو نیشانە دەشکێنێ.

★ (من لم یرکب الأهوال لم ینل الآمال)

★ سوار تا نەگلێ نابێ بە سوار.

★ (لەگەڵ گورگدا گۆشت دەخوا و لەگەڵ مەڕدا شین دەکا).

★ بانێکە و دوو هەوا.

★ ئازایەتی بە بێ زانین ئاگرێکی بێ ڕوناکییە.

★ زاری بە شیری سوتا بو فوی لە (دۆ)ش دەکرد.

★ پیاوی شەرمن (شای)یەك نایەنێ، ژنی شەرمن شارێك دێنێ.

★ زمانت یەکە و گوێچکەت دووانە واتە یەك بڵێ دووان بزانە.

★ ئەوەی ناوکی بوێت دەبێ توێکڵ بشکێنێ.

★ زێڕی پاك لە ئاگر ناترسێ.

★ هیچ دارێك نەماوە با نەیهەژاندبێ.

★ نەفام ئەو کەسەیە کە نهێنی خۆی لات باس دەکات و دوایی تکات لێ دەکات بیشاریتەوە.

★ پیاوی سەرکەوتو هەوڵ دەدات لە قسەکردندا لەسەرخۆ بێت و لە هەڵسوکەوتدا زۆر جددی بێت.

★ ئەگەر دەتەوێ لە ڕەخنە دوور بیت، هیچ مەڵێ، هیچ مەکە، هیچ مەبە.

★ ئەوەی بە دوای هەڵەدا بگەڕێت لە هەڵە بەولاوە هیچی تر نادۆزێتەوە.

★ هەزار قسە لە تەرازوودا ناگاتە کردەوەیەك.

★ زانای هەژار دەوڵەمەندە بە زانستەکەی، دەوڵەمەندی نادان هەژارە بە نادانییەکەی.

★ ئەو کەسەی نەزانە و نازانێ نەزانە/گەوجە و لێی بە دوور بە.

★ ئەو کەسەی نەزانە و ئەزانێ نەزانە/نەفامە و فێری کە.

★ ئەو کەسەی زانایە و نازانێ زانایە/نووستوە و هەڵی بستێنە.

★ ئەو کەسەی زانایە و دەزانێ زانایە/ژیرە و پەیڕەوی لێ بکە.

★ بەرز مەفڕە نزم دەنیشیتەوە.

★ ئەوەی دڕکان بچێنێ نابێ بە پێ خاوسی بڕوا.

★ لە زۆر وتنا ڕاستی ون ئەبێ.

★ جوابی نەزان بێ دەنگییە.

★ سزای گران جان لێ نەکرێنە.

★ کەس لە پڕێ نابێ بە کوڕێ.

★ گوڵە ژاڵە بەڵێ ئاڵە بەلام تاڵە.

★ بەردی بچوکیش سەردەشکێنێ.

★ برا لە پشت برا بێ، مەگەر قەزا لای خوای بێ.

★ بێ کەسی هەر بۆ خوا چاکە.

★ ئەوەی لە شەڕدا نەبێ شێرە.

★ ئەمن ئاغا و تۆ ئاغا، ئەی کێ جێمان بۆ ڕاخا.

* بە پێکەنینی زاڵم باوەڕ مەکە.
* تەنیا لە هاوڕێی خراپ چاکترە.
* ڕاست بەو بە لای شێردا بڕۆ.
* شێر بمشکێنێ نەك ڕێوی بمخوا.
* بە قسەی خۆش مار لە کون دێتە دەر.
* لە هەمو هەورێك باران نابارێ.
* ئازا جارێك ئەمرێت، ترسنۆك ڕۆژی سەد جار.
* لە پاش هەمو ناخۆشییەك خۆشییە.
* هەمو هەورازێك نشێوێکی هەیە.
* کیسەی پڕ برادەری زۆرە.
* چیا بە چیا ناگەڤن، بەلێ چاو ل چاڤا دگەڤن.
* لە سەرەوە یارە، لە ژێرەوە مارە.
* لە سەرەوە هەی ئەکا و لە ژێرەوە دەی ئەکا.
* پڕ دەبێتەوە جێی خەنجەران، پڕ نابێتەوە جێی کەسەران.
* مێشولە کۆمەڵ بێت فیل یخ دەدات.
* سەرمایەت بۆ خۆت زەکات بۆ خودا.
* میوەکە بیبڕی چاکتر بەر دەدا.
* باخەوان لە کاتی ترێدا گوێی گرانە.
* هەر دەوەنە دەبێت بە دار.
* دەریا بە دەمی سەگ پیس نابێت.
* خۆی ڕیشی نییە بە کۆسە پێ دەکەنێ.
* نە بۆ کوێر هەڵپەڕە، نە بۆ کەڕ گۆرانی بڵێ.

* کێوێك نەڕوخێ، کەندەڵانێك پڕ نابێتەوە.
* دوژمن بچوکیش بێت ئیشی زل دەکات.
* ژن سەگیش پێی ناوەڕێ.
* کوڕی ئازا بەسەر ئاوەوە ئاگر دەکاتەوە.
* دنیا بە ئومێد خوراوە.
* پەنجەی دەستان هەمو وەکی یەك نین.
* لەسەر فرسەتان باز مەدە.
* مەچوە بن بارێك پێت هەڵنەستێ.
* حەسەد دەردێکی گرانە چارەی هەر لە خوا ترسانە.
* لە ئاوی مەند و لە پیاوی مۆن بترسە.

تێبینی:

لەبەرئـەوەی قوتابیـان لـە پۆلـەکانی یەکـەم و دووەم و سـێیەمی ناوەندیـدا قۆناغی منداڵێتی دەبڕن بۆیە ئەم قۆناغەمان ناونا (نەوجەوانان).

بە پێی بەشەکان سەرچاوەکان دیاری کراون.

خوا پاداشتی ئەو کەسە بداتەوە کە ڕەخنـە و تێبـینی و پێشـنیازی تازەمـان بۆ دەنێرێ لەسەر بەرنامەی پەروەردەیی منداڵان و نەوجەوانان.

مامۆسـتا دەتوانـێ هـەر لـە دوو هەفتـە جارێکـدا پەنـدێك بـە نەوجـەوانان لەبەربکات.

## دوا وتە

بە ئومێدی ئەوەی ئەمکتێبە ببێتە مایەی سودمەند بونی موسڵمانان و بکرێتە پرۆگرامێکی گشتی بۆ پەروەردە کردنی نەوەکانمان بۆ ئەوەی لە داهاتودا مرۆڤی ساڵح و دەست و دەم و داوێن پاکییان لێ دەربچێت و کۆمەڵگا لەبەریان بحەسێتەوە.

ئەڵبەتە پرۆژەیەکی هێندە گەورە و بەر فراوان بە تەنها کەسێکی وەك من جێبەجێ نەدەکرا، ئەگەر هاوکاری دەستە برایەکی بەڕێزم نەبوایە. ئەو بەڕێزانەی لە سەرەتاوە تا کۆتایی پرۆژەکە وەك لیژنەیەك هاوکارم بون ئەم برایانە بون: مامۆستا احمد صالح، مامۆستا فائق سلیم، کاك مختار محی الدین، کاك شێرزاد عبدالله، کاك محمد احمد تەکیەیی، خوای گەورە وێنەیان زیاد بکات و پاداشتی خێریان بداتەوە، بێگومان نوسینگەی تەفسیر هاوکارێکی دڵسۆز و لێهاتو بو بۆ بە چاپ گەیاندن و بڵاو کردنەوەی ئەم زنجیرەیە، خوای گەورە پڕ بەرەکەت و پارێزراوی بکات و خاوەنەکەشی سەرکەوتوی هەردوو جیهانی بکات، هیوادارین توانیبێتمان ئەرکی سەرشانی خۆمان جێبەجێ بکەین و کەلێنێکی بەرچاو لە خزمەت کردنی ڕابون و بێداربونەوەی نەوەی نوێدا پڕ بکەینەوە.

وصلى الله على سيدنا محمد وعلى آله وصحبه أجمعين والتابعين لە بأحسان و يقين والحمد لله رب العالمين. وآخر دعوانا أن الحمد لله رب العالمين.

# سەرچاوەکان

معالم التوحيد - د.مروان ابراهيم القيسي
العقيدة الإسلامية - محمد بن جميل زينو
منهاج الفرقة الناجية - محمد بن جميل زينو
الإيمان، أركانه، حقيقته، نواقضه - محمد نعيم ياسين
شرح أصول الإيمان - محمد بن صالح العثيمين
مختصر شرح العقيدة الطحاوية - للألباني
تجريد التوحيد المفيد - للمقريزي
اعلام السنة المنشودة - احمد بن حافظ الحكمي
العقيدة الإسلامية و أسسها - عبدالرحمن حسن حبنكة
مختصر صحيح البخاري - د.مصطفى ديب البغا
منهاج المسلم - ابوبكر جابر الجزائري
مختصر منهاج القاصدين - ابن قدامة المقدسي
صفة صلاة النبي - محمد بن ناصرالدين الألباني
نيل الأوطار - الشوكاني
الأدلة المرضية لمتن الدرر البهية في المسائل الفقهية - الشوكاني
ففروا الى الله - أبي ذر القلموني
فقه الميسر - احمد عيسى عاشور
فقه السنة - السيد سابق
حكم تارك الصلاة و كيف تصلي - احمد عيسى عاشور
الجواب الكافي - ابن القيم الجوزي
العبودية - ابن تيمية
ادب المسلم - محمد سعيد مبيض
تحفة الذاكرين - الشوكاني
الاذكار - النووي
حصن المسلم - سعيد بن علي القحطاني
رياض الصالحين - النووي
صحيح الكلم الطيب - ابن تيمية
قطوف من الشمائل المحمدية - محمد بن جميل زينو
تفسير القرآن العظيم - ابن كثير

